د. ئێبێن ئەلێگزاندەر






# مردوویەك دەگەڕێتەوە!!

## پزیشکێکی نەشتەرگەری مێشك پاش مردنی زیندوو دەبێتەوە و نهێنییەکان دەدرکێنێت

لە ئینگلیزییەوە: بەرهەم ناودەشتی

چاپی یەکەم

2013

# مردوویەک دەگەڕێتەوە

## پزیشکێکی نەشتەرگەری مێشک پاش مردنی زیندوو دەبێتەوە و نهێنییەکان دەدرکێنێت

نوسینی: د. ئێبێن ئەلێگزاندەر

و. لە ئینگلیزییەوە: بەرهەم ناودەشتی

چاپی یەکەم

٢٠١٣

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە: ٤١٢

0000000000

**ناسنامەی کتێب**

**مردوویەک دەگەڕێتەوە**

- ناوی نووسەر د. ئیبێن ئەلێگزاندەر
- ناوی وەرگێڕ: بەرهەم ناودەشتی
- تایپ: وەرگێڕ
- نەخشەسازیی و بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٣
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە: (٠٠٠)ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە

ناونیشان

لێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٢) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)



## پێڕست

# پێشەکی

پێویستە مرۆڤ بەدوای ئەوەدا بگەڕێت کە هەیە، نەك
ئەوەی کە پێی وایە دەبێ هەبێت.
ئەلبێرت ئەنیشتاین (١٨٧٩-١٩٥٥)

کاتێك منالٚ بووم زۆربەی کات خەوم بە فڕینەوە دەبینی.

زۆربەی کات لە شەودا لە حەوشەکەمان دەوەستام، سەیری ئەستێرەکانم دەکرد، کاتێك لەپڕ بەرەو سەرەوە ئەکەوتمە ناو هەوا. چەند سانتیمەتری یەکەم بەشێوەیەکی خۆبەخۆ روویدەدا. بەلاّم بە زوویی تێبینی ئەوەم دەکرد کە چەندەی بەرز ببمەوە، ئەوەندە زیاتر بەرەوپێشچوونەکەم دەکەوێتە سەر خۆم- لەو کارەی کە ئەمکرد. ئەگەر زۆر جۆش و خرۆشم بکەوتایەتە بەر، ئەزموونەکە زۆر پەرتی بکردمایە، ئەوا بەردەبوومەوە سەر زەوی. . . بە توندیش. بەلاّم ئەگەر لەسەرخۆ بوومایە لەگەلّیدا، بمگرتایەتەخۆ، ئەوا خێراتر و خێراتر، بەرەو ئاسمانی پڕ ئەستێرە، لەگەلّیدا دەڕۆیشتم.

لەوانەیە ئەو خەونانە بەشێك بووبن لەو هۆکارەکەی کە بۆچی، کاتێك گەورە دەبووم، عاشقی فڕۆکە و رۆکێت بووم- هەر شتێك کە لەوانەبوو بمگەڕێنێتەوە

جیهانی سەروو ئەم جیهانەی ئێستا. کاتێك خانەوادەکەمان بە فڕۆکە فڕین، روخسارم لکابوو بە پەنجەرەی فڕۆکەکەوە هەر لە هەڵسانەوە تا نیشتنەوە. لە هاوینی ١٩٦٨دا، کاتێك چواردە ساڵان بووم، هەموو ئەو پارەیەی کە لە کورتکردنی فریزی حەوشەکان بە دەستم هێنابوو لە وانەکانی فڕۆکەی بێ ماتۆڕ خەرجم کرد لەگەڵ کابرایەکدا بەناوی (گوس ستریت) لە لە ناوچەی (سترۆبێری هیل)، پشتێنەیەکی فریزی بچوك "فڕۆکەخانە" رێك لە خۆرئاوای (وینستن سالەم)ی باکووری کالیفۆرنیا، ئەو شارەی تیایدا گەورە بووم. هێشتا خورپەی دڵم لە یادە کاتێك ئەو دەسکە سوورە گێلاسییەم راکێشا کە گرێی ئەو گوریسەی کردەوە کە منی بە فڕۆکە راکێشەرەکەوە بەستبووەوە و فڕۆکە بێ ماتۆڕەکەم بەرەو گۆڕەپانەکە ئاراستە کرد. ئەمە یەکەم جار بوو کە هەست بکەم بە راستی تەنیا و سەربەستم. زۆربەی هاوڕێکانم لەناو ئۆتۆمبێلەکاندا ئەو هەستەیان کردبوو، بەڵام بەهۆی پارەکەمەوە بەرزبوونەوە بە هەزار پێ لە فڕۆکەیەکی بێ ماتۆڕدا، سەدانی قاتی ئەو دڵڕفێنییە بوو.

لە ١٩٧٠کاندا لە کۆلێژ، پەیوەندیم کرد بە تیمی پەڕەشوتی زانکۆی (نۆرس کارۆلاینا). ئەمە وەکو گروپێکی برایانەی نهێنی بوو– گروپێك لە خەڵکی کە لەبارەی شتێکی تایبەت و جادووییەوە دەیانزانی. یەکەم بازدانم تۆقێنەر بوو، دووەمیان زیاتریش. بەڵام دوانزەهەمین بازدانم، کاتێك پێم لە دەرگایەکە بردە دەرەوە و دەبووایە لە بەرزایی زیاتر لە هەزار پێ بەر ببمەوە پێش ئەوەی پەڕەشوتەکەم بکەمەوە (یەکەم "دواخستنی دە چرکەیی"م)، زانیم کە لە ماڵەوەم. لە کۆلێژ ٣٦٥ بازم ئەنجامدا و زیاتر لە سێ سەعات و نیوم مانەوە لە هەوادا تۆمار کرد، بەزۆریش بەشێوەی ئەڵقەی بەکۆمەڵ لەگەڵ زیاتر لە بیست و پێنج هاوەڵی

تردا. هەرچەندە لە ١٩٧٦دا وازم لە بازدان هێنا، لە خەوبینینی نیوەبێدار بە بازدان لە هەوا بەردەوام بووم، کە هەمیشە خۆش بوو.

باشترین بازدانەکان لە درەنگانی پاش نیوەڕۆدا بوون، کاتێك خۆر پەیتا پەیتا لە ئاسۆدا نغرۆ دەبوو. سەختە وەسفی ئەو هەستە بکەیت کە لەو بازدانانە بەدەستم دەهێنا: هەستی نزیك کەوتنەوە لە شتێك کە نەمدەتووانی بە تەواوی ناوی بنێم، بەڵام دەمزانی کە دەبێ زیاتر و زیاتر ئەنجام بدەم. کتومت لە خەڵوەتدا نەبوو، چونکە بەو شێوازەی کە خۆمان هەڵدەدا لە واقیعدا بەو شێوەیە تەنیایانە نەبوو. ئێمە پێنج، شەش، هەندێ جاریش دە دوانزەکەس پێکەوە لە یەك کاتدا خۆمان هەڵدەدا، ئەڵقەی بەکۆمەڵمان پێکدەهێنا. چەندەی گەورەتر و پڕتەحەدیتر بووایە، باشتر دەبوو.

شەممەیەکی جوانی پایزی ١٩٧٥، من و بەشەکەی تری بازدەرەکانی زانکۆی نۆرس کارۆلاینا خۆمان لەگەڵ هەندێ لە هاوڕێیانمان لە سەنتەری پەڕەشوتەوانی لە خۆرهەڵاتی (نۆرس کارۆلاینا) یەکخست بۆ ئەنجامدانی هەندێ ئەڵقەی بەکۆمەڵ. لە بازدانی پێش کۆتاییمان لەو رۆژەدا، لە فڕۆکەیەکی (دی هەژدە بیچکرافت) لە بەرزایی ١٠,٥٠٠ پێیەوە، پروشە بەفرێکی دەکەسیمان دروستکرد. خۆمان خستەناو ئەڵقەیەکی تەواوەوە پێش ئەوەی ٧٠٠٠ پێ تێپەڕێنین و بەمشێوەیە توانیمان هەژدە چرکەی تەواو خۆشی ببینین لە ئاراستەکردنی ئەڵقەکە رووەوە شەقارێکی روونی نێوان دوو پەڵە هەوری چڕ پێش ئەوەی لە بەرزایی ٣,٥٠٠ پێ پەرتەوازە ببین و لێك دوور بکەوینەوە بۆ کردنەوەی پەرەشوتەکانمان.

بە هاتنی ئەو کاتەی کە دەگەیشتینە سەر زەوی، خۆر ئاوا ببوو. بەڵام بە پرتاوکردن رووەو فڕۆکەیەکی تر و دەستبەجێ بەرزبوونەوە لەسەر زەوی،

گەڕاینەوە سەری سەرەوە بۆئەوەی بۆئەوەی بچینەوە ناو دوایین تیشکەکانی خۆر و دووەمین بازدانی خۆرئاوابوون ئەنجام بدەین. بۆ ئەمەیان، دوو ئەندامی تازە، یەکەم تاقیکردنەوەیان خۆیان لە فڕین لە ئەڵقەدا ئەنجام دەدا– واتە هاتنەپاڵ لە دەرەوەڕا نەك ئەمەی بناغەی ئەڵقەکە یان گرێدەرەوە کۆمەڵەکە بیت (کە ئاسانترە چونکە لە بنەڕەتدا ئیشەکەت خۆبەردانەوەی راستەوخۆیە لەکاتێکدا کە هەموو ئەوانەیتر بەرەو تۆ ڕێ دەکەن). دۆخێکی دڵڕفێن بوو بۆ ئەندامە تازەکان، بەڵام بۆ ئەوانەش لە ئێمە کە بەئەزموونتر بوون، چونکە ئێمە تیمەکەمان بونیاد دەنا، ئەزموونی ئەو بازدەرانەمان زیاد دەکرد کە دواتر دەیانتووانی تەنانەت بۆ ئەڵقەی گەورەتر بێنە پاڵمان.

من دەبوومە دوایین کەس لە هەوڵی ئەستێرەیەکی شەش کەسی لەسەروو ڕێڕەوەکانی فڕۆکەخانە بچوکەکەی دەرەوەی شاری (ڕۆنۆك راپیدز)ی نۆرس کارۆلاینا. ئەو کابرایەی کە راستەوخۆ لە پێش منەوە بووناوی (چوك) بوو. چوك باش شارەزا بوو لە "کاری ڕێژەیی"– واتە دروستکردنی ئەڵقەکانی بە هەواداچوون. ئێمە لە بەرزایی ٧٥٠٠ پێ هێشتا لەبەر رووناکی خۆردا بووین، بەڵام مایلێك* و نیو لەژێرمانەوە لایتەکانی سەر شەقام دەبریسکانەوە. بازدانەکانی دەمی زەردەپەڕ هەمیشە بێ وێنە بوون و ئەمەش دیار بوو کە جوان دەبێ.

هەرچەندە من دەورووبەری چرکەیەك پاش چوك لە فڕۆکەکە دەردەرچووم، دەبووایە خێرا بجولێم بۆئەوەی بگەمەوە هەمووان. من لە یەکەم حەوت چرکەدا راستەوخۆ لە ڕێگەی سەرمەوە تیرەیەك بەناو هەوادا لێدەدەم. ئەمە وام لێدەکات

---

* یەك مایل دەکاتە ١. ٦٠٩ مەتر

تەقریبەن ١٠٠ مایڵ خێراتر لە سەعاتێکدا خێراتر لە هاوڕێکانم بەربیمەوە بۆئەوەی بتووانم پاش ئەوەی ئەڵقە سەرەتاییەکەیان دروستکردووە لایان بم.

ڕێوشوێنی ئاسایی بازدانەکانی (کاری ڕێژەیی)ٚ ئەوە بوو کە هەموو بازدەرەکان لە بەرزایی ٢٥٠٠ پێوە پەرتەوازە بن و بۆ مەیسەربوونی گەورەترین جیابوونەوە لە ئەڵقەکە دوور بکەونەوە. ئەو کاتە هەریەکەیان دەستی رادەوەشێنێت (وەکو هێماکردنێك بۆ دەکارکردنی پەڕەشوتەکەی)، ڕوو دەکاتە سەرەوە بۆ دڵنیابوون لەوەی کەسیتر لەسەروو خۆی نەماوە، پاشان پەتی بەرەڵاکردنی پەرەشوتەکە رادەکێشێت.

"یەڵڵا، سیٚ، دوو، یەك. . دەی! "

چوار بازدەری یەکەم دەرچوون، پاشان من و چوك نزیك لە دوای ئەوانەوە. لە بارێکدا کە سەرەو خوار بە خێراییەکی توندەوە دەجولام، خەندە گرتمی کە بۆ دووەمین جار لەو ڕۆژەدا ئاوابوونی خۆرم بینی. پاش ئەوەی گەیشتمە لای ئەوان، پلانم ئەوە بوو برێك (ئیستۆپ)ە هەواییەکان بکەمەوە لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی باسکەکانمەوە (ئێمە هەر لە مچی دەستەوە تا سمتمان باڵی قوماشمان هەبوو کە بەرەنگارییەکی گەورەیان دروست دەکرد کاتێك لەوپەڕی خێراییدا بە تەواوی هەڵدەئاوسان).

بەڵام هەرگیز دەرفەتم نەبوو.

بە کەوتنە لای ئەڵقەکە، بینیم کە یەکێك لە ئەندامە نوێکان زۆر بە خێرایی هاتووە. لەوانەیە بەربوونەوە بە خێرایی لەنێوان هەورە نزیکەکان کەمێك ترساندبێتی– بیری هێناوەتەوە کە ئەو دووسەد پیٚ لە چرکەیەکدا لە جوڵەدایە بەرەو ئەو هەسارە گەورەیەی خوارەوە، لایەکی لەناو تاریکییەکەدا بزر بوو. لەبری

ئەوەی بە هێواشی بێتە پاڵ کەناری ئەڵقەکە، خۆی پیا کرد و هەمووانی پەرت و بڵاو کرد. ئێستا هەر پێنج بازدەرەکەی تر بە خۆکۆنترۆڵەکراوی بەردەبوونەوە.

ئەوان زۆر نزیکیش بوون لە یەکترییەوە. پەڕەشوتەوان رەوگەیەکی نارێکی پەستانی نزم لەدوای خۆی جێدەهێڵێت. ئەگەر بازدەر بکەوێتە ناو ئەو رەوگەیە، دەستبەجێ خێرایی زیاد دەبێ و دەشێ خۆی بکێشێ بە کەسی ژێر خۆیدا. دەشێ ئەمەش بە نۆرەی خۆی تەکان بداتە هەردوو بازدەرەکە و خۆیان بکێشن بە هەر کەسێك کە لەژێریانەوە بێ. بە کورتی، ئەمە شێوازێکی کارەساتە.

من جەستەم لەلاوە راگرت و لە گروپەکە خۆم بەدوور راگرت بۆ خۆلادان لە پشێوییەکە. من خۆم جولاند تا ئەوەی کە بەشێوەیەکی دروست بەسەر "پەڵە دیاریکراوەکە"دا بەردەبوومەوە، خاڵێکی جادوویی لەسەر گۆڕەپانەکە کە لەسەرڕوویەوە دەبووایە پەڕەشوتەکەمان بۆ دوو خولەکی سەرگەرمکەری دابەزین بکەینەوە.

سەرم هەڵبڕی و هەستم بە ئاسودەیی کرد کە بینیم بازدەرە سەرلێشێواوەکانیش ئێستا لەیەکتر دوور دەکەونەوە و تۆپەڵە کوشندەکە پەرت و بڵاو دەکەنەوە.

چوك لەناوماندا بوو. سەرم سوڕما کە رێك بە ئاراستەی من دێت. رێك لە ژێر منەوە وەستا. لەکاتێکدا کە هەموو گروپەکە بەخێرایی بەردەبوونەوە، ئێمە لە دابەزین بە ئاقارێکی ٢٠٠٠ پێییدا بووین، خێراتر لەوەی کە چوك چاوەڕێی دەکرد. لەوانەیە پێی وابووبێت کە ئەو خۆشبەختە و پێویست ناکات پەیرەوی لە یاساکان بکات— بەشێوەی کتومت.

(نابێ بمبینێت). ئەم بیرۆکەیە بە زحمەت کاتی ئەوەی هەبوو بە مێشکمدا بێت پێش ئەوەی پەڕەشوتە یاریدەدەرە رەنگاورەنگەکەی چوك لە کۆڵەپشتەکەی بێتە

دەزەوە. پەرەشوتە یاریدەدەرەکەی شەو شنەبا ١٢٠ مایلْ لە سەعاتێکدایەی گرت کە بەدەوریدا دەهات و ڕێك بە ئاراستەی من دەرچوو، ڕێك لە دواشیەوە پەرەشوتە سەرەکییەکەی راکێشا.

لە دوورەوە بینیم کە پەرەشوتە یاریدەدەرەکەی چوك دەردەچێت، من نیوە چرکەیەکم هەبوو تا کاردانەوە نیشان بدەم. چونکە کەمتر لە چرکەیەکی پێدەچوو تا بەربێتەوە سەر پەرەشوتە هەڵدراوەکەی و — و بە ئەگەرێکی زۆر— سەر چوك خۆی. بەو خێراییە، ئەگەر من بەر باسك یان قاچی بکەوم ڕێك لێیدەکەمەوە، لە پرۆسەکەشدا زبرێکی کوشندەش لە خۆم دەدەم. ئەگەر راستەوخۆ بەر ئەو بکەوم، هەردوو جەستەمان دەتەقێت.

خەڵکی دەڵێن شتەکان لە بارودۆخی وەهادا زۆر بە خاوی دەجولێن، راستیش دەڵێن. هۆشم، کردارەکەی لە چەند نیوەچرکەیەکدا بینی وەکو بڵێی دەڕوانێتە فیلمێك بەشێوەی کارەبایی (جولەی خاو).

هەرکە پەرەشوتە یاریدەدەرەکەم بینی، باسکەکانم بەلای جەستەمدا پەرت بوون و جەستەم بە ئاراستەی سەرمدا پەرت کرد، کەمێکیش بە ئاراستەی حەوزمدا چەمامەوە. ستوونیبوون خێرایی زیاتری پێدام و چەمانەوەکە یەکەم جار کەمێك، پاشان تەوژمێك لە جولەی ئاسۆیی پێدام لەکاتێکدا کە جەستەم بووە باڵێکی تەواو، بە خێرایی بە تەنیشت چوك—دا ئاراستەی دەکردم لەبەردەم پەرەشوتە رەنگاورەنگە روو لەکرانەوەکەیدا.

بە خێرایی ١٥٠ مایلْ لە سەعاتێکدا، یان ٢٢٠ پیْ لە چرکەیەکدا، بەلایدا تێپەریم. بەو خێراییە، گومانم هەیە لەوەی کە گوزارشتی روخساری منی بەدی کردبێت. بەڵام ئەگەر بەدی بکردایە، ئەوا نیگایەکی سەرسوڕمانی گەورەی دەبینی. بە شێوەیەك

لە شێوەکان کاردانەوەم بەرانبەر دۆخەکە نیشاندا کە ئەگەر کاتی بیرلێکردنەوەم هەبووایە، مامەڵەلەگەڵکردنی ئاڵۆزتر دەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا. . . ڕووبەڕووی بوومەوە و هەردووکمان بە سەلامەتی نیشتینەوە. وەکو ئەوەش وابوو کە بڵێی بارودۆخەکە توانایەکی سەروو خۆی پێویستە بۆ نیشاندانی کاردانەوە لە بەرانبەریدا، مێشکم بۆ ساتێك هێزێکی سەرووئاسایی پەیدا کردبوو.

چۆن ئەمەم کردبوو؟ لە ماوەی زیاتر لە بیست ساڵی کارکردنم لە نەشتەرگەری دەماردا– تاووتوێکردنی مێشك، چاودێریکردنی ئەمەی کە چۆن ئیش دەکات و ئیش لەسەر کردنی– دەرفەتی یەکجار زۆرم هەبووە بۆ تێڕامان لەم پرسیارە. دواجار گەیشتمە ئەو ڕاستییەی کە مێشك بە ڕاستی ئامێرێکی سەرووئاساییە: زیاتر لەوەی کە تەنانەت بتوانین مەزەندەشی بکەین.

ئێستا من بۆم دەردەکەوێ کە وەڵامی ئەو پرسیارە زۆر قووڵترە. بەڵام دەبووایە بە وەرچەرخانێکی تەواوی ژیان و جیهانبینیمدا ڕەت ببم بۆئەوەی سەرنج لەو وەڵامە بدەم. ئەم کتێبە لەبارەی ئەو ڕووداوانەوەیە کە ئەقڵیان لەسەر ئەو بابەتە گۆڕیم. ئەمانە قەناعەتیان پێ هێنام کە مێشك چەنێك میکانیزمێکی گەورەشە، ئەو ڕۆژە بەهیچ شێوەیەك مێشکم نەبوو ژیانی ڕزگار کردم. کە لە ساتی کرانەوەی پەڕەشوتەکەی چوك-دا کردارەکەی بەجێگەیاند، بەشێکی قووڵتری منە. بەشێك کە دەیتووانی زۆر خێرا بجوڵێت چونکە بەهیچ شێوەیەك لە زەمەندا قەتیس نەببوو، بەو شێوەیەی کە مێشك و جەستە وەهان.

لە ڕاستیدا، ئەمە هەمان ئەو بەشەی من بوو کە منی تامەزرۆی ئاسمانەکان کردبوو کە منداڵ بووم. ئەمە تەنیا زیرەکترین بەشی ئێمە نییە، بەڵکو قووڵترین

بەشیشە، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ زۆربەی هەرە زۆری ساڵانی ژیانی پێگەیشتووییم نەمدەتوانی بڕوای پێ بێنم.

بەڵام ئێستا بڕوام پێیەتی و لاپەڕەکانی دواتری ئەم کتێبە پێت دەڵێن بۆچی.

من نەشتەرگەرێکی مێشکم.

لە زانکۆی نۆرس کارۆلاینا، شارۆچکەی (چاپڵ هیڵ) لە ساڵی ١٩٧٦ بە شارەزایەتیی سەرەکی کیمیاوە تەخەروجم کرد و بڕوانامەی پزیشکیم لە ساڵی ١٩٨٠دا لە سکوڵی پزیشکیی (دیوک)بەدەستهێنا. لەماوەی ١١ ساڵی سکوڵی پزیشکیم و ڕاهێنانی شارەزایەتیم لە (دیوک) و هەروەها نەخۆشانەی گشتیی ماساشوسێتس و هارڤارد، تەرکیزم خستبووەسەر (نیورۆئێندۆکرینۆلۆجی)، واتە توێژینەوەی کارلێکەکانی نێوان سیستەمی دەمار و سیستەمی ئێندۆکرین- زنجیرەیەك غودە (ڕژێنەکان) کە ئەو هۆرمۆنانە دەردەدەن کە زۆربەی چالاکییەکانی جەستەت ئاراستە دەکەن. هەروەها دوو لەو یانزە ساڵانەم بە توێژینەوەی ئەوە بەسەر برد کە چۆن دەمارەکان لە ڕووبەرێکی مێشکدا لەڕووی نەخۆشییەوە پەرچەکردار پیشان ئەدەن کاتێك لە حاڵەتێکی سوربوونەوە و ئاوسانی دەمارەکانەوە خوێنبەربوون بۆ ناوەوەی ئەو ڕووبەرە هەیە.

پاش تەواوکردنی زەمالەیەك لە بواری نەشتەرگەریی مێشك لە (نیوکاسڵ ئوپۆن تاین) لە بریتانیا، پانزە ساڵم وەکو پرۆفیسۆری یاریدەدەری نەشتەرگەری لە سکوڵی پزیشکیی هارڤارد بە پسپۆڕێتیی نەشتەرگەریی مێشکەوە بەسەربرد. لە ماوەی ئەو ساڵانەدا من ئیشم لەسەر نەخۆشێکی بێ شومار کردووە کە زۆرێکیان نەخۆشیی کوشندەیان هەبووە.

زۆربەی توێژینەوەکانم لەسەر گەشەکردنی ڕێوشوێنە تەکنیکییە پێشکەوتووەکان بووە وەکو (ستێریۆتاکتیك ڕەدیۆسێرجەری) تەکنیکێك کە ڕێکە بە نەشتەرگەران دەدات تا دەقاودەق پڕشنگی تیشك ئاراستەی نیشانە دیاریکراوی ناو قووڵایی مێشك بکەن بەبێ ئەوەی کار بکاتە سەر رووبەرەکانی دەورووبەر. هەروەها یاریدەدەر بووم لە گەشەپێدانی وێنەی (ئێم ئاڕ ئای)– ڕێوشوێنی نەشتەرگەریی دەماریی ئاراستەکراو کە گرنگە بۆ چاککردنەوەی هەلومەرجی سەختی مێشك، وەکو وەرەم و تێکچوونی خوێنهێنەرەکان. لە ماوەی ئەو ساڵانەدا من نووسەر یان بەشدار بووم لە نووسینی زیاتر لە ١٥٠ بەش و توێژینەوە بۆ بڵاوکراوە پزیشکییەکان و ئەنجامەکانی خۆم لە زیاتر لە دووسەد کۆنفرانسی پزیشکیدا خستووەتەڕوو لە سەرانسەری جیهاندا.

بەکورتی، خۆمم بۆ زانست تەرخان کردووە. بەکارهێنانی ئامێرەکانی پزیشکیی سەردەم بۆ یارمەتیدان و چاککردنەوەی خەڵك و فێربوونی زیاتر لەبارەی کردارەکانی جەستە و مێشکی مرۆڤ، پیشەی ژیانم بووە. بەشێوەیەکی بێ پایان هەستم بە خۆشبەختی کردووە لە بەرانبەر دۆزینەوەیدا. لەوەش گرنگتر، ژنێکی جوان و دوو منداڵی دڵگیرم هەبوون و لەکاتێکدا کە لە زۆر ڕووەوە هاوسەرگیریم لەگەڵ ئیشەکەمدا بوو، خانەوادەکەمم لەبیر نەکرد کە من بە نیعمەتێکی تری ژیانم دانا. لە زۆر ڕووەوە پیاوێکی خۆشبەخت بووم و ئەمەم زانیووە.

لە ١٠ی مانگی ١١ی ٢٠٠٨دا، لە تەمەنی پەنجاو چوار ساڵیدا، پێدەچوو بەختم دوایی هاتبێ. تووشی نەخۆشییەکی دەگمەن بووم و بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ کەوتمە دۆخی کۆما*وە. لەو ماوەیەدا، تەواوی (نیۆکۆرتێکس)م– ڕووی دەرەوەی مۆخ،

* دۆخێکی بێهۆشیی قووڵ، بەزۆری کاتێکی درێژ دەخایەنێت و بەهۆی بریندارییی یان نەخۆشییەکی قورسەوە دروست دەبێ.

ئەو بەشەی کە دەمانکاتە مرۆڤ– لەکار کەوت. ئیشی نەدەکرد، لە جەوهەردا، بزر بوو.

کاتێك مێشکت بزرە، تۆش بزریت. من وەکو نەشتەرگەرێکی مێشك ساڵانێك زۆر بەسەرهاتم بیستووە لەبارەی ئەو خەڵکانەی ئەزموونی سەیریان هەبووە، بەزۆریش پاش تووشبوون بە وەستانی دڵ: بەسەرهاتی سەفەر بۆ شوێنی نامۆ و خۆش. لەبارەی قسەکردن لەگەڵ خزم و کەس– تەنانەت بینینی خودی خوا.

بێگومان شتی سەیر سەیر. بەڵام بە بۆچوونی من هەمووی تەنیاوتەنیا خەیاڵپڵاوی بوون. چی بووەتەهۆی ئەو جۆرە ئەزموونانەی دنیای دیکە کە زۆرجار ئەو خەڵکانە باسی دەکەن؟ من بانگەشەی ئەوەم نەدەکرد کە دەیزانم، بەڵام دەمزانی کە ئەمانە سەرچاوەگرتووی مێشکن. هەمووی هۆشە. ئەگەر تۆ مۆخێکی ئیشکەرت نەبێ، ئەوا ناتووانیت لەسەر هۆش بیت.

ئەمە لەبەر ئەوەیە کە مۆخ ئەو مەکینەیەیە کە لە بنەڕەتەوە هۆش یان ئاگایی بەرهەم دێنێت. کاتێك مەکینەکە پەکی دەکەوێ، هۆش دەوەستێ. میکانیکی واقیعیی پرۆسەکانی مۆخ چەنێك ئاڵۆز و نامۆ بێ، لە جەوهەردا مەسەلەکە هەروا سادەیە. پلاکەکە راکێشە، تەلەڤزیۆنەکە دەکوژێتەوە. بەرنامەکە تەواو، گرنگ نییە چەنێك خۆشیت لێ بینیووە.

بەهەمان شێوەش من وەهام پێ دەوتن پێش ئەوەی مێشکم لەکار بکەوێت.

لەماوەی کۆماکەمدا مێشکم نەك هەر بە نارێکی ئیشی نەدەکرد– هەر بە هیچ شێوەیەك ئیشی نەدەکرد. ئێستا بڕوام وایە کە لەوانەیە ئەمە بەرپرس بووبێت لە قووڵایی و چڕیی ئەزموونی نزیکەمەرگ کە خۆم پیایدا تێپەڕیم. زۆرێك لەو ئەزموونە نزیکە مەرگانە باس لە روودانیان دەکرێت کاتێك دڵی مرۆڤ بۆ ماوەیەك لەکار

کەوتووە. لەو حاڵەتانەدا، (نیۆکۆرتێکس) بەشێوەیەکی کاتی لە چالاکی دەکەوێ، بەڵام بە گشتی ئەوەندە زیانی بەرناکەوێ، بەو مەرجەی کە تەوژمی خوێنی ئۆکسجیناوی لە رێگەی هەناسەپێدانی دەستکرد یان چالاککردنەوەی کرداری دڵ لەماوەی چوار خولەك یان زیاتر گەڕێنرابێتەوە. بەڵام لە حاڵەتی مندا، (نیۆکۆرتێکس) لەکایەدا نەبوو. من رووبەڕووی واقعی جیهانێکی ئاگایی ببوومەوە کە بە تەواوی لە دەرەوەی سنوورەکانی مێشکی جەستەییمدا بوو.

ئەوەی من لە هەندێ رووەوە زریانێکی هەڵتەکێن بوو. وەکو نەشتەرگەرێکی مومارسی مێشك کە زیاتر لە دوو دەیە لە توێژینەوە و ئەزموونی کارم هەیە لە ژووری نەشتەرگەریی پشت خۆمەوە، لە پێگەیەکی باشتر لە مام ناوەند دا بووم بۆ نەك تەنیا حوکمدان لەسەر واقیع بەڵکو (دەلالات)ی ئەو شتەش کە بەسەرمدا هات.

ئەو دەلالاتە مەزنن و لە باسکردن نایەن. ئەزموونەکەم پیشانی دام کە مەرگی جەستە و مێشك کۆتایی هۆش یان ئاگایی نین و ئەزموونی مرۆیی لەودیو گۆڕەوە بەردەوام دەبێ. لەوەش گرنگتر، لەژێر چاودێریی خودایەکدا بەردەوام دەبێ کە هەریەك لە ئێمەی خۆش دەوێ و بەلایەوە گرنگین و گرنگیش دەدات بەوەی کە گەردوون خۆی و هەموو بوونەوەرەکانی ناوی بەرەوی کوێ ڕێ دەکەن.

ئەو شوێنەی کە بۆی چووم راستەقینە بوو. بەشێوەیەك واقیعی بوو کە ئەگەر بەراوردی بکەین، ئەم ژیانەی ئێمە ئێستا و لێرە دەژین بە تەواوی وەکو خەون و خەیاڵ لێدەکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە بەو مانایە نییە کە ئەو ژیانەی ئێستا دەژیم نانرخێنم. لە راستیدا، لە پێشتر زیاتر نرخی پێدەدەم. ئەمە دەکەم لەبەرئەوەی ئێستا لە فۆرمە راستەکەیدا دەیبینم.

ئەم ژیانە بێ مانا نییە. بەڵام ناتوانین ئەم راستییە لێرەوە تێبینی بکەین–لانی کەم زۆربەی کات. ئەوەی بەسەرم هات لەکاتێکدا کە لەو کۆمایەدا بووم، بێگومان گرنگترین بەسەرهاتێکە کە بیگێڕمەوە لە ژیانمدا. بەڵام گێڕانەوەی بەسەرهاتێکی وەها، سەختە چونکە زۆر نامۆیە بۆ لێتێگەیشتنێکی ئاسایی. ناتوانم هەروا بە سانایی لەسەر سەربانەکانەوە هاواری بۆ بکەم. لە هەمان کاتدا، ئەنجامگیرییەکانی من لەسەر بنەمای شیکردنەوەیەکی پزیشکیی ئەزموونەکەم و ئاشنایەتیمن لەگەڵ چەمکە هەرە پێشکەوتووەکان لە زانستی مێشك و توێژینەوەکانی بواری ئاگاییدا. هەر کە راستیی پشت گەشتەکەمم بۆ دەرکەوت، زانیم کە دەبێ بیگێڕمەوە. کردنی ئەم کارە بە شێوەیەکی رێکوپێك بووەتە ئەرکی سەرەکیی ژیانم.

ئەمە بەو مانایە نییە کە بڵێین من وازم لە کاری پزیشکی و ژیانم وەکو نەشتەرگەرێکی مێشك هێناوە. بەڵام ئێستاکە شانازیی ئەوەم پێبڕاوە لەوە تێبگەم ژیانمان بە مەرگی جەستە یان مێشك کۆتایی نایەت، بە ئەرکی خۆم، پیشەی خۆمی دەبینم ئەوەی لەودیو جەستە و ئەم زەوییەوە بینیم بۆ خەڵکی بگێڕمەوە کە لەوانەیە پێشتر بەسەرهاتی هاوشێوەی ئەوەی منیان بیستبێت و ویستبێتیان بڕوای پێبێنن، بەڵام نەیانتوانیبێت بە تەواوەتی ئەمە بکەن.

من زیاتر لە هەر کەسانێکی تر، ئەم کتێبە و پەیامەکەی ناوی، ئاراستەی ئەوان دەکەم. ئەوەی کە دەبێ بە ئێوەی بڵێم وەکو هەر شتێکی تر کە هەر کەسێکی تر پێتان دەڵێت گرنگە، و ڕاستە.

بەشی یەکەم

# ئازارەکە

## لینچبێرگ، ڤیرجینیا-١١ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٨

چاوەکانم کرانەوە. لە تاریکایی ژووری نوستنەکەماندا، تەرکیزم خستە سەر درەوشانەوەی سووری سەعاتەکەی نزیك پێخەفەکەم: ٤:٣٠ بەرەبەیان- سەعاتێك پێش ئەوەی بێدار بمەوە بۆ ئۆتۆمبێل لێخوڕینە حەفتا خولەکییەکەم لە ماڵەکەمانەوە لە (لینچبێرگ، ڤیرجینیا) بەرەو دامەزراوەی (فۆکەسد ئەڵتراساوند سێرجەری) لە (شارلۆتسڤیڵ) بەڕێ بکەوم، واتە شوێنی کارەکەم. ژنەکەم، (هۆڵی)، هێشتا لە تەنیشتمەوە لە قووڵایی خەوەکەیدا بوو.

پاش بەسەربردنی نزیکەی بیست ساڵ لە بواری ئەکادیمیی نەشتەرگەریی مێشك لە ناوچەی گەورەی شاری (بۆستن)، پێش دوو ساڵ واتە لە ٢٠٠٦دا لەگەڵ (هۆڵی) و باقی خانەوادەکەمان بەرەو بەرزاییەکانی (ڤیرجینیا) گواستبوومانەوە. من و هۆڵی لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٧دا یەکتریمان ناسیبوو، دوو ساڵ پاش ئەوەی هەردووکمان کۆلێژمان تەواو کردبوو. هۆڵی خەریکی دیراسات بوو بۆ ماستەرەکەی

له هونه‌ره جوانه‌کاندا و من له سکوڵی پزیشکی بووم. ئه‌و له‌گه‌ڵ هاوڕێی به‌شه ناوخۆییه‌که‌ی کۆلێژم (ڤیك) چه‌ند جارێك پێکه‌وه دانیشتبوون. رۆژێکیان ڤیك ئه‌وی له‌گه‌ڵ خۆیدا هێنا بۆئه‌وه‌ی پێمی بناسێنێت- له‌وانه‌شه بۆئه‌وه‌ی پۆزی پێوه لێدات. له‌کاتێکدا که خه‌ریك بوو بڕۆن، من به (هۆڵی)م وت که هه‌رکاتێك ویستی سه‌ر بدات، هه‌روه‌ها وتم ناچار نیت ڤیك له‌گه‌ڵ خۆت بهێنیت.

له یه‌که‌م ژوانی راسته‌قینه‌ماندا، به ئۆتۆمبێل به‌ره‌و ئاهه‌نگێکی رۆیشتین له (شارلۆت)ی نۆرس کارۆلاینا، که هه‌ر سه‌رێك به ئۆتۆمبێل دوو سه‌عات و نیو ده‌بێ. هۆڵی قوڕگی ئاوسابوو بۆیه ده‌بووایه له هه‌ردووسه‌ر من ٩٩٪ی قسه‌کان بکه‌م. ئاسان بوو. له حوزه‌یرانی ١٩٨٠دا له که‌نیسه‌ی (قه‌دیس تۆماس) له (ویندسۆر)ی نۆرس کارۆلاینا هاوسه‌رگیریمان کرد و دواتر به‌زوویی به‌ره‌و شوقه‌کانی رۆیاڵ ئۆکس ( به‌ڕووی پاشایه‌تی) رۆیشتین له (دورهام) که له‌وێ من نه‌شته‌رگه‌ری مه‌شقکار بووم له (دیوك). شوێنه‌که‌مان هیچ پاشایانه نه‌بوو بیریشیم نایه‌ت له‌و ناوه به‌ڕووم بینیبێت. پاره‌یه‌کی زۆر که‌ممان پێبوو به‌ڵام هه‌ردووکمان ئه‌وه‌نده سه‌رقاڵ بووین- ئه‌وه‌نده‌ش دڵخۆش بووین پێکه‌وه- که باکمان نه‌بوو. یه‌کێکیان له گه‌شتی پشووه‌که‌مان سه‌یرانێکی به‌هاری بوو له که‌ناراوه‌کانی نۆرس کارۆلاینا. به‌هار وه‌رزی ئه‌و میشوولانه‌یه که نابینرێن و پێوه ده‌ده‌ن له هه‌ردوو ویلایه‌تی کارۆلایناکه و خێمه‌که‌مان پارێزگاریی پێویستی بۆمان دابین نه‌ده‌کرد له‌دژیان. که‌چی خۆشییه‌کی زۆرمان بینی. پاش نیوه‌ڕۆیه‌کیان له (ئۆکراکۆك) له‌سه‌ر شه‌پۆله‌کانی ئاو مه‌له‌مان کرد، من شێوازێکم گه‌ڵاڵه کرد بۆ گرتنی قرژاڵه قاوغ شینه‌کان که له‌ده‌وری پێیه‌کانم ده‌هاتن و ده‌چوون. ئێمه کیسه‌یه‌کی گه‌وره‌مان لێ پڕ کرد و بردمان بۆ مۆتێلی (پۆنی ئایله‌ند) که له‌وێ هه‌ندێ له هاوڕێیان ده‌مانه‌وه

و لەسەر ئاگر برژاندمانن. ئەوەندە زۆر بوو بەشی هەمووانی دەكرد. سەرباری بارودۆخی خراپی هەموومان، زۆری پێنەچوو كە زانیمان پارەیەكی یەكجار كەممان پێماوە. ئێمە لەگەڵ باشترین هاوڕێكانمان (بیل) و (پاتی ویلسن) دەماینەوە ولەپڕ بڕیارماندا بۆ شەوێكی یاری (بینگۆ) هاوڕێیەتییان بكەین. بیل دە ساڵ بوو هەموو پێنجشەممەیەكی هاوین دەچوو و قەت نەیدەبردەوە. هۆڵی یەكەم جار بوو یارییەكەی دەكرد. بەمە بڵێ بەختی دەستپێكەران، یان كاری خوا، بەڵام ئەو دووسەد دۆلاری بردەوە– كە بۆ وەكو پێنج هەزار دۆلار وابوو. پارەكە گەشتەكەمانی درێژ كردەوە و ئارامتری كرد بۆمان.

من لە ١٩٨٠دا بڕوانامەی پزیشكیم بەدەست هێنا رێك لەو كاتەدا كە هۆڵی خوێندنەكەی تەواوكرد و پیشەكەی وەكو هونەرمەند و مامۆستا دەستپێكرد. من لە ساڵی ١٩٨١دا یەكەم نەشتەرگەریی بە تەنیای مۆخم لە (دیوك) ئەنجامدا. منالی نۆبەرەمان (ئێبێنی چوارەم) لە ١٩٨٧دا لە لە ماوەی زەمالەكە لە بواری نەشتەرگەریی مێشك، لە شاری (نیوكاسڵ ئەپۆن تاین)ی باكووری ئینگلتەرە لە نەخۆشخانەی لەدایكبوونی (پرینسێس ماری) لەدایكبوو و كوڕە بچوكترەكەمان (بۆند) لە نەخۆشخانەی (بریگام ئەند وەمن) لە ساڵی ١٩٩٨ لەدایكبوو.

پانزە ساڵی كاركردنم لە سكوڵی پزیشكیی هارڤارد و نەخۆشخانەی (بریگام ئەند وەمن) پێ خۆش بوو. خانەوادەكەمان ئەو ساڵە بەنرخانەی لە ناوچەی گەورەی بۆستن بەسەر برد. بەڵام، لە ساڵی ٢٠٠٥دا، من و هۆڵی رازیبووین لەسەر ئەوەی كە كاتی ئەوەیە بگەڕێینەوە بۆ باشوور. دەمانویست لە خانەوادەكەمانەوە نزیكتر بین و من ئەمەم وەكو دەرفەتێك دەبینی بۆ هەبوونی سەربەخۆییەكی كەمێك زیاتر لەوەی كە لە هارڤارد هەمبوو. بۆیە لە بەهاری ٢٠٠٦دا، لە لینچبێرگ لە

بەرزاییەکانی ڤیرجینیا لە نوێوە دەستمان پێکردەوە. ماوەیەکی زۆری نەخایاند بۆمان کە گەڕاینەوە ناو ژیانێکی ئارامتر کە ئێمە لە سەروەختی گەشەکردنمان لە باشوور بەسەرمان برد.

بۆ ساتێك تەنیا لەوێ پاڵ کەوتم، بەشێوەیەکی تەمومژاوی هەوڵمدەدا تەرکیز بخەمە سەر ئەوەی کە بێداری کردمەوە. ڕۆژی پێشوو-یەکشەممە- خۆرەتاو، ڕوون و سارد بوو- کەش و هەوای کۆنی درەنگانی پاییزی ڤیرجینیا. من، هۆڵی و بۆند (ئەو کاتە دە ساڵان بوو) چووین بۆ خواردنی گۆشتی برژاو لە ماڵی دراوسێیەکمان. لە ئێوارەدا بە تەلەفۆن قسەمان لەگەڵ (ئێبێنی چوارەم)ی کوڕمان کردبوو (ئەو کاتە بیست ساڵان بوو) کە ساڵی پێش کۆتایی بوو لە زانکۆی (دێلاوێر). تاکە گرفتی ڕۆژەکە ئەو ڤایرۆسەی کۆئەندامی هەناسە بوو کە من، هۆڵی و بۆند لە هەفتەی پێشووەوە پێمانەوە دەناڵاند. پێش چوونە ناو پێخەف پشتم دەستی بە ئازار کردبوو، بۆیە حەمامێکی خێرام کردبوو، کە پێدەچوو ئازارەکەی کپ کردبێتەوە. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ ئەم بەیانییە لەبەر ئەوە وەها زوو بێدار بوومەتەوە کە ڤایرۆسەکە هێشتا لە جەستەمدا خۆی حەشار داوە.

لەسەرخۆ لەناو جێگەکەمدا وەرچەرخام و ژانێك لەسەر ڕا بە بڕبڕەی پشتمدا هات- زۆر توندتر لەوەی شەوی پێشوو. دیار بوو کە ڤایرۆسی هەڵامەتەکە هێشتا ئامادەیی هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی زیاتر. چەندەی زیاتر بێدار ببوومایەتەوە، ئەوەندە ژانەکە زیاد دەبوو. لەبەرئەوەی خەوم پیا نەدەکەوتەوە و سەعاتێکم هەبوو بەر لەوەی ڕۆژی کارم دەست پێبکات، بڕیارم دا حەمامێکی گەرمی تر بکەم. لەناو جێگەدا دانیشتم، قاچەکانم هەڵدانە سەر زەوییەکە و لەسەر پێ وەستام.

دەستبەجێ ئازارەکە هورووژمێکی تری هێنا– بروسکێکی بەردەوامی قورس کە تا قوولایی حەوزم بڕی کرد. هۆڵی–م بە خەوتوویی جێهێشت، بە وریاییەوە بە مامەڕەکەدا بەرەو گەرماوی نهۆمی سەرەوە هەنگاوم نا.

هەندێ ئاوم بەردایەوە و خۆم خستە ناو حەوزەکە، تەواو دڵنیا بووم کە گەرمییەکە دەستبەجێ سوودێکی دەبێ. وانەبوو. بە هاتنی ئەو کاتەی کە حەوزەکە نیوەپڕ ببوو، زانیم هەڵەم کردووە. نەك تەنیا ئازارەکەم زیاد دەبوو، بەڵکو ئەوەندە توند ببوو کە ئێستا دەترسام هاوار بکەمە هۆڵی تا بێت یارمەتیم بدات لە حەوزەکە بێمە دەرەوە.

لەکاتێکدا کە بیرم لەوە دەکردەوە بارودۆخەکە چەندە پڕوپوچ بووە، دەستم بۆ خاولییەك راکێشا کە رێك بە شەمعەیەکی سەر سەرمەوە هەڵواسرابوو. خاولییەکەم زۆر بە وریاییەوە گرتبوو بۆئەوەی شەمعەکە لە دیوارەکە نەبێتەوە و بە هێواشی خۆم هەستاندە سەر پێ.

بروسکێکی تری ئازار لە پشتم وەستا، ئەوەندە توند بوو کە نالاندم. گومانی تیا نییە ئەمەیان ئەنفلوەنزا نەبوو. ئەی دەبێ چی بێ؟ پاش پەلەقاژەی هاتنە دەر لە حەوزە لوسەکە و لەبەرکردنەوەی رۆبە هەناریبە چنراوەکەم، بە هێواشی گەڕامەوە بۆ ژووری نوستنەکەمان و خۆم هەڵدایە سەر جێگەکەمان. جەستەم هەنوکە جارێکی تر شێدار بوو بەهۆی ئارەقکردنەوەی سەرماوە. هۆڵی لەسەرخۆ جولا و وەرچەرخا.

"ئەوە چییە؟ سەعات چەندە؟ "

وتم "نازانم. پشتم، ئازارێکی زۆرم هەیە".

هۆڵی دەستیکرد بە شێلانی پشتم. پێم سەیر بوو کەمێك باشتر بووم. دکتۆرەکان بەزۆری دان بە نەخۆشبوون دانانێن. منیش هەر یەکێکم لەوان. بۆ ساتێك گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە ئازارەکە- و هەرشتێك کە بووەتە هۆکاری- دواجار دەست بە کپبوون دەکات. بەڵام لە هاتنی ٦: ٣٠ی سەر لە بەیانی، ئەو کاتەی کە بەزۆری دەچمە سەر ئیش، هێشتا لە عەزابدا بووم و تەقریبەن ئیفلیج ببووم.

بۆند سەعات ٧: ٣٠ هاتە ژووری نوستنەکەمان، پێی سەیر بوو کە بۆچی هێشتا لە ماڵەوەم.

"ئەوە چییە؟ "

هۆڵی وتی، "کوڕم باوکت حاڵی باش نییە".

من هێشتا لەسەر جێگە پاڵ کەوتبووم و سەرم لەسەر سەرینێك دانا بوو. بۆند هاتە لامن دەستی درێژ کرد و بە نەرمی دەستیکرد بە ماساژ کردنی هەردوو تەنیشتە سەرم. دەستلێدانی، شتێکی ئاراستە کرد کە هەستێکی وەکو ، هەورەبروسکی بەناو سەرمدا پێدام- توندترین ئازار تاوەکو ئەو کاتە. لەقیژەمدا. لەکاتێکدا کە ئەو کاردانەوەیەم سەری سوڕماندم، بۆند بازیدایە دواوە.

هۆڵی بە بۆندی وت، "هیچ نیە"، بێگومان بەشێوەیەکی تر بیری دەکردەوە، "ئەوەی تۆ کردت هیچ نیە. باوکت ژانەسەرێکی توندی لێیە". پاشان گوێم لێبوو، زیاتر لەبەر خۆیەوە نەك لە بەرانبەر من، دەیگووت: "نازانم تەلەفۆن بۆ ئامبولانس بکەم یان نە".

ئەگەر شتێك هەبێ کە دکتۆرەکان زیاتر لە نەخۆشبوون رقیان لێی بێت، لە ژووری ئیمێرجێنسی بوونە وەکو نەخۆش. وێنەی ئەوەم هێنایە بەرچاوی خۆم کە

ماڵەکە پڕ بووە لە تەکنیکییە پزیشکییەکانی ئیمێرجێنسی، کۆمەڵە پرسیارێکی ئامادە، لێخوڕین بەرەو نەخۆشخانە، ڕۆتینیاتی کاغەز. . . لە ساتێك لە ساتەکاندا بیرم لەوە دەکردەوە کە هەست دەکەم بەرەو باشی دەچم و لە تەلەفۆن کردن بۆ ئامبولانس هەر لەسەرەتاوە پەشیمان بوومەوە.

وتم "نا، قەینا. ئێستا توندە بەڵام لەوانەیە بە زوویی هێور بێتەوە. دەتوانی یارمەتی بۆند بدەی ئامادە بیّ بۆ چوونە قوتابخانە".

"ئێبێن، بە راستی پێم وایە____"

قسەم پێبڕی، "باش دەبم"، روخسارم هێشتا رۆچووبووە ناو سەرینەکە. ئازارەکە هێشتا ئیفلیجی کردبووم. وتم، "بە جددیمە، تەلەفۆن بۆ فریاکەوتن مەکە. ئەوەندە نەخۆش نیم. تەنیا تەشەنوجە لە ماسولکەی خوارەوەی پشتم و سەرم دێشێت".

هۆڵی بە نابەدڵییەوە بۆندی بردە خوارەوە و هەندێ نانی دایە پێش ئەوەی بینێرێتە سەرەوەی شەقامەکە بۆ ماڵی هاوڕێیەك بۆئەوەی سواری ئۆتۆمبێل بێت بۆ قوتابخانە. لەکاتێکدا کە بۆند لە دەرگای پێشەوە دەچووە دەر، ئەوەم بە خەیاڵدا هات کە ئەگەر ئەمە حاڵەتێکی جددی بێت و داخڵی نەخۆشخانە بکرێم، لەوانەیە ئەو پاش نیوەڕۆیە دوای قوتابخانە نەیبینم. تەواوی وزە و هێزم لەخۆمدا کۆکردەوە و بە دەنگێکی کزرەوە وتم "ڕۆژێکی خۆش لە قوتابخانە، بۆند".

بە هاتنی ئەو کاتەی کە هۆڵی گەڕایەوە نهۆمی سەرەوە بۆئەوەی بزانێ چۆنم، بەرەو بێهۆشی دەچووم. بەو خەیاڵەی کە سەرخەو دەشکێنم، جێیهێشتم تا پشوو بدەم و چووە خوارەوە بۆئەوەی هەندێ لە هاوکارەکانم بانگ بکات، بەو هیوایەی کە ڕەئیان وەرگرێت لەبارەی ئەوەی ئەم حاڵەتە چی بێ.

دوو سەعات دواتر، کە هەستی کردبوو بایی پێویست لێم گەڕاوە تا پشوو بدەم، هاتەوە سەرم بۆئەوەی بزانێ حالم چۆنە. کە پالی بە دەرگاوەی ژووری نوستنمانەوە نا، بینی کە وەکو پێشوو لەناو جێگەدا راکشاوم. بەلام کاتێکی لە نزیکترەوە سەیری کرد، بینی کە جەستەم وەکو پێشوو شل و خاو نییە، بەلکو وەکو تەختە ڕەقە. گلۆپەکانی هەلکرد و بینی بە توندی پەلەقاژەمە. شەویلگەی خوارەوەم بەشێوەیەکی ناسروشتی بەرەو پێشەوە دەردەچوو، چاوەکانم کرابوونەوە و بەرەو دواوە دەسوڕان.

هۆلی قیژاندی "ئێبێن، شتێ بلێ! ". کاتێك وەلامم نەبوو، تەلەفۆنی بۆ فریاکەوتن کرد. دە خولەکی پێنەچوو کە تەکنیکییە پزیشکییەکانی فریاکەوتن گەیشتن و بە خێرای خستمیانە ناو ئامبولانسێك کە بەرەو ژووری فریاکەوتنی نەخۆشخانەی گشتیی لینچبێرگ بەڕێکەوت.

ئەگەر لەسەر هۆش بوومایە، دەمتووانی بە هۆلی بلێم کە لەناو جێگەکەدا لە چ حالێکدا بووم لەو ساتە تۆقێنەرانەدا کە ئەو لە چاوەڕوانی ئامبولانسدا بوو: گەشکەیەکی گەورەی تەواوەتی، کە بێگومان بەهۆی شۆکێکی توند لە سەرمدا دروست ببوو.

بەلام بێگومان نەمدەتووانی ئەمە بکەم.

بۆ ماوەی حەوت ڕۆژی دواتر، من تەنیا لە جەستەدا لای هۆلی و تەواوی خانەوادەکەم ئامادەییم دەبوو. لەماوەی ئەو هەفتەیەدا هیچ شتێکی ئەم جیهانەم لەیاد نییە و دەبووایە لەوانیترەوە ئەو زانیارییانە وەرگرم کە لەماوەی بێ هۆشیمدا روویانداوە. ئەقلم، گیانم– هەر شتێك کە حەز بکەیت وەکو بەشە مرۆییە سەرەکییەکەی ناوی بێنیت– نەمابوو.

بەشی دووەم

# نەخۆشخانە

ژووری ئیمێرجێنسی نەخۆشخانەی گشتیی لینچبێرگ، دووەم قەرەباڵغترین ژووری ئیمێرجێنسییە لە ویلایەتی ڤێرجینیا و و بەشێوەیەکی گشتی و بەهاتنی سەعات ٩: ٣٠ ی بەرەبەیانێکی ڕۆژی دەوام لەوپەڕی جۆش و خرۆشدایە. ئەو دووشەممەیەش هەروابوو. هەرچەندە من زۆربەی ڕۆژانی کار لە شارلۆتسڤیڵ بەسەر دەبرد، بڕێکی زۆری کاتی ئیشکردنم لە نەخۆشخانەی گشتیی لینچبێرگ بەسەر دەبرد و تەقریبەن هەمووانم لەوێ دەناسی.

لۆرا پۆتەر، ئەو پزیشکەی ژووری فریاکەوتن کە دەمناسی و بۆ نزیکەی دوو ساڵ لە نزیکەوە ئیشم لەگەڵدا کردبوو، پەیوەندییە تەلەفۆنییەکەی لە ئامبولانسەکەوە پێگەیشتبوو کە پیاوێکی قەوقازیی پەنجاوچوار ساڵە لە تەنگەژەی گەشکەدایە و خەریکە دەگاتە ژووری ئیمێرجێنسییەکەی. لەکاتێکدا کە ڕووی کردبووە دەروازەی ئامبولانسەکە، چاوی خشاندبوو بە لیستێك هۆکاری شیمانەیی بۆ حاڵەتی نەخۆشێکی وەها. ئەمە هەمان ئەو لیستە بوو کە ئەگەر لە جێی ئەو بوومایە دەچوومە سەری: دەستبەردان لە کحول، زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی دەرمان،

هیپۆناترێما (ئاستی یەکجار نزمی سۆدیۆم لە خوێندا)، سەکتە، وەرەمی سەرەتایی یان تەشەنەکردووی مێشك، ئینتراپارێنکیمەڵ هێمەرج (خوێنبەربوون بۆ ناو ماددەی مۆخ)، ئاوسانی مێشك. . . و ئاوسانی شانەکانی دڕکەپەتك.

کاتێك تەکنیکییە پزیشکییەکانی فریاکەوتن بردیانم بەرەو بەشی سەرەکیی ژمارە (١)ی ژووری ئیمێرجێنسی، من هێشتا بە توندی پەلەقاژەم دەکرد لەکاتێکدا کە ناوبەناو دەمناڵاند و دەست و پێم دەوەشاند.

بەلای دکتۆر پۆتەرەوە روون بوو کە بە گوێرەی پەلەقاژەی بەردەوامم، مێشکم لەژێر هێرشێکی قورسدایە. پەرستارێك سەبەتەی ئامرازەکانی هێنا، یەکێکی تر خوێنی گرت و سێیەمیان یەکەم کیسەی ئاوی دڵۆپێنراوی بەتاڵی ئاڵوگۆڕ پێکرد، کە تەکنیکییە پزیشکییەکانی ئیمێرجێنسی لای ماڵمانەوە بۆیان دانابووم پێش ئەوەی سواری ئامبولانسەکەم بکەن. لەکاتێکدا کە رۆیشتن ئیشم لەسەر بکەن، وەکو ماسییەکی شەش پێ کە لە ئاو دەرهێنراوە، هەڵبەز و دابەزم دەکرد. شەپۆلە دەنگی بێ مانای شێواو و هاواری ئاژەڵ ئاسام دەردەکرد. هەروەکو چۆن نەوبەکان بۆ لۆرا پڕگرفت بوون، ناهاوسەنگیی کۆنترۆڵی جوڵەی جەستەشم هەروا بوو. لەوانەبوو ئەمە بەو مانایە بێت کە نەك تەنیا مێشکم لەژێر هێرشدابوو بەڵکو زیانێکی جددی و لەوانەشە چاك نەبووەوە لەمێشکم هەنووکە بەرێوەیە.

دیمەنی هەر نەخۆشێك لە دۆخێکی وەهادا لەگەڵ راهاتنی دەوێ، بەڵام لۆرا هەموو ئەمانەی لەو ساڵانەی ئیشکردن لە ژووری ئیمێرجێنسیدا بینیبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قەت نەیبینیبوو یەکێك لە هاوەڵە پزیشکەکانی بەو حاڵەتەوە داخڵی ژووری ئیمێرجێنسی بکرێت و لە نزیکەوە بڕوانێتە نەخۆشێکی گێژ و فلیجی دەم بە هاوار و ناڵە لەسەر نەقالەیەك، ئەو، تەقریبەن لەبەر خۆیەوە وتی، "ئیبێن".

پاشان، بە دەنگێکی بەرزتر، دکتۆر و پەرستارەکانی تری ئەو ناوەی وریا کردەوە: "ئەوە ئێبێن ئەلیگزاندەرە".

ستاڤ دەوروبەرم کە گوێیان لێ بوو، لە دەوری نەقالەکەم کۆبوونەوە. هۆڵی، کە بەدوای ئامبولانسەکەدا هاتبوو، هاتە ناو قەرەباڵغییەکە لەکاتێکدا کە لۆرا پرسیاری ناچاری لەبارەی هۆکارە ئەگەرییە روونەکانی حاڵەتی کەسێکی وەکو من ئاراستە دەکرد. ئایا لە دۆخی وازهێنان لە کحول بووم؟ ئایا بەو زووانە هیچ ماددەیەکی (مهلوسات)ی سەر جاددەکانم بەکارنەهێناوە؟ پاشان رۆیشتە سەر ئیش لە هەوڵی ئەوەی کە نەوبەکانم بوەستێنێت.

لەو چەند مانگەی دواییدا، ئێبێنی چوارەم منی لە پرۆگرامێکی راهێنانی پڕ جۆش و خرۆشدا دانابوو بۆ شاخەوانییەکی باوك-کوڕی رێکخراو لە شاخی (کۆتۆپاکسی)ی ١٩,٣٠٠ پێیی لە ئیکوادۆر کە ئەو مانگی شوباتی پێشتر بەسەریدا سەرکەوتبوو. پرۆگرامەکە بەشێوەیەکی بەرچاو توانای زیادکردبووم کە بۆ کارمەندانی نەخۆشخانەی سەخت کردبوو بموەستێنن. دوای پێنج خولەك و ١٥ میلیگرام لە ئاوی (دیازپام)، هێشتا شێتگیر بووم و هەوڵم دەدا بەرەنگاری هەمووان بکەم، بەڵام لە بەختی دکتۆرە پۆتەر، لانی کەم ئێستا، لەگەڵ هەردوو لای جەستەی خۆم شەڕم دەکرد. هۆڵی ئەو سەرئێشە توندەی بۆ لۆرا باس کرد کە من هەمبوو پێش ئەوەی تووشی نەوبەکە ببم کە وای لە دکتۆرە پۆتەر کرد کونکردنی ناوچەی کەمەر ئەنجام بدات- رێوشوێنێك کە تیایدا بڕێکی بچوکی شلەی بڕبڕەی پشت دەهێنرێتە دەرەوە.

شلەی بڕبڕەی پشت ماددەیەکی ئاویی روونە کە بە درێژایی رووی درکەپەتك دەڕوات و مێشك رووپۆش دەکات، بەمشێوەیە لە کاریگەرییەکان دەیپارێزێت.

جەستەیەکی تەندروستی ئاسایی، نزیکەی نیو لتری لە رۆژێکدا لێ بەرهەم دێنێت و هەر کەمبوونەوەیەکی روونیی شلەکە دەریدەخات کە ئاوسانێك یان خوێنبەربوونێك روویداوە.

ئاوسانێکی وەها پێی دەوترێت (مێنینجایتس): هەڵئاوسانی ئەو توێژاڵە تەنکانەی کە ناوپۆشی بڕبڕەی پشت و کەللەسەر دەکەن و لە پەیوەندیی راستەوخۆدان لەگەڵ شلەکەدا. لە پێنج کەیس لە چواریاندا، ڤایرۆسێك دەبێتەهۆی نەخۆشییەکە. توێژاڵە تەنکەکان دەتووانن نەخۆشێك تووشی حاڵەتێکی تەواو سەخت بکەن، بەڵام تەنیا لە نزیکەی ١٪ی کەیسەکاندا کوشندەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، لە یەك کەیسی پێنج کەیسدا، بەکتریا دەبێتەهۆی مێنینجایتس. بەکتریا، بەهۆی (بەرابیتربوون)یەوە لە ڤایرۆس، دەتووانێ دوژمنێکی ترسناکتر بێت. حاڵەتەکانی (مێنینجایتس)ی بەکتریایی وەکویەك کوشندەن ئەگەر چارەسەر نەکرێن. تەنانەت ئەگەرچی بە (ئەنتی بایۆتیك*)ی پەیوەندیداریش بە خێرایی چارەسەر کرا، ئاستی مردن لە ١٥٪ەوە بۆ ٤٠٪ە.

یەکێك لە هۆکارە هەرە لاوازەکانی (مێنینجایتس)ی بەکتریایی لە پێگەیشتوواندا بەکتریایەکی زۆر کۆن و زۆر سەرسەختە بەناوی (ئێسچێریچیا کۆلی)– کە بە ئی کۆلای باشتر ناسراوە. کەس نازانێ ئی کۆلای کتومت چەند ساڵە، بەڵام مەزەندەکان دەڵێن لەنێوان سێ بۆ چوار ملیارد ساڵدایە. زیندەوەرەکە ناوکی نییە و بە پرۆسەیەکی بەرایی بەڵام چالاك زۆر دەبێت، کە بریتییە لە دووکەرتبوون. وێنای خانەیەك بکە، کە بە شێوەیەکی سەرەکی پڕە لە DNA، دەتوانێت ماددەی خۆراکدەر راستەوخۆ لە رێگەی دیوارەکەیەوە لە خانەکانی تر وەربگرێت

---

* ئەنتی بایۆتیك: دژەبەکتریا

(بەزۆری لەو خانانەی ترەوە کە هێرشیان دەکاتەسەر و هەڵیاندەمژێت). ئینجا وێنای ئەوە بکە کە لە هەمان کاتدا دەتوانێت ژمارەیەك شریتی DNA کۆپی بکات و لە هەر بیست خولەکێکدا بۆ دوو خانەی خوشك دوورکەرت ببێت. لە سەعاتێکدا، تۆ ٨ دانەت دەبێ. لە دوانزە سەعاتدا، ٦٩ ملیاردت دەبێ. بە هاتنی سەعاتی پانزەهەم، ٣٥ تریلیۆنت دەبێ. ئەم گەشە بۆمب ئاسایە تەنیا ئەو کاتە خاو دەبێتەوە کە خۆراکەکەی بەرەو تەواوبوون دەچێت.

بەکتریاکانی ئی. کۆلای بەهەمان شێوە فرەسەرچاوەن. دەتوانن جینەکان لەگەڵ توخمەکانی بەکتریای تر ئاڵوگۆڕ بکات لە رێگەی پرۆسەیەکەوە کە پێی دەوترێت شێوەگۆڕکێی بەکتریایی کە رێگە دەدات بە خانەی ئی. کۆلای تا بە خێرایی تایبەتمەندیی نوێ هەڵبگرێت (وەکو بەرەنگاری لە بەرانبەر ئەنتی بایۆتیکی نوێ) ئەگەر پێویست بکات. ئەم شێوازەی سەرکەوتن بەکتریاکەی پاراستووە لە رۆژانی ژیانی تاك خانەییەوە. ئی. کۆلای لە ناو هەمووماندا نیشتەجێیە– بەزۆریش لە هەناودا. لە دۆخی ئاساییدا، ئەمە هەرەشە نییە لەسەرمان. بەڵام کاتێك جۆرەها ئی. کۆلای ئەو شریتە DNAیەیان هەڵگرتووەتەوە کە بەشێوەیەکی تایبەت دەیانکات بە شەڕانگێز، ئەوا شلەی دەوری دڕەکەپەتك و مێشك داگیر دەکەن، خانە بەرایییەکان دەست بەجێ دەست دەکەن بە قوتدانی گلوکۆزی ناو شلەکە و هەرشتێکی تر کە هەبێت بۆ هەڵلوشین، لەوانەش خودی مێشك.

کەس لەناو ژووری ئیمێرجێنسی، لەو ساتەدا، بیری لەوە نەدەکردەوە کە من (مێنینجایتس)ی ئی. کۆلی–م هەیە. هیچ هۆکارێکیشیان نەبوو بۆئەوەی ئەو گومانە بکەن. نەخۆشییەکە بەشێوەیەکی بەرچاو لە پێگەیشتوواندا دەگمەنە.

منالّی ساوا قوربانییانی هەره سەرەکین، بەڵام حاڵەتی ئەو منالآنەی کە سەروو سێ مانگن و تووشی ئەو نەخۆشییە بوون زۆر کەمە. لە هەر ساڵێکدا، کەمتر لە یەك لە دە ملیۆن پێگەیشتوو بەشێوەیەکی رەمەکی تووشی دەبێت.

لە حاڵەتی (مێنینجایتس)ی بەکتریاییدا، یەکەم جار بەکتریاکە هێرش دەکاتە سەر توێژاڵی دەرەوەی مێشك، یان بڵێین کۆرتێکس. وشەی کۆرتێکس لە وشەیەکی لاتینییەوە هاتووە و مانای "توێکڵ" یان "توێخ" دەگەیەنێت. ئەگەر تۆ وێنەی پرتەقاڵێك بێنیتە بەر چاو، توێکڵەکەی نموونەیەکی باشە بۆ ئەوەی چۆن کۆرتێکس دەوری بەشە هەره بەراییەکانی مێشك دەدات. کۆرتێکس بەرپرسە لە یادەوەری، زمان، هەست، هۆشیاریی بینایی و بیستن و لۆژیك. بۆیە کاتێك زیندەوەرێکی وەکو ئی. کۆلای هێرش دەکاتەسەر مێشك، زیانی سەرەتایی لەو رووبەرانە دەکەوێ کە کرداری زۆر چارەنووسساز جێبەجێ دەکەن بۆ بەرقەرارکردنی تایبەتمەندییە مرۆییەکانمان. زۆرێك لە قوربانیانی (مێنینجایتس)ی بەکتریایی لە چەند رۆژێکی یەکەمی نەخۆشییەکەیاندا دەمرن. لەوانەی کە لە حاڵەتی دابەزینێکی خێرای زیانەکە بۆ سەر کرداری دەماری دەگەنە ژووری ئیمێرجێنسی، وەکو من، تەنیا ١٠٪ بایی پێویست بەختی مانەوەیان هەیە لە ژیاندا. لەگەڵ ئەوەشدا، بەختیان سنووردارە، چونکە زۆرێکیان بەشی زۆری ژیانیان لە زیندەگیی جەستەییدا بەسەر دەبەن بێ ئەوەی مێشکیان ئیش بکات.

هەرچەندە ئەو پێشبینیی (مێنینجایتس)ی ئی. کۆلای نەکرد، دکتۆرە پۆتەر وای بۆچوو کە من جۆرێك ئاوسانی مێشکم هەبێ بۆیە بڕیاری ئەوەیدا ناوچەی کەمەرم کون بکات. رێکە لەو کاتەدا کە بە یەکێك لە پەرستارەکانی وت سینی کونکردنی ناوچەی کەمەری بۆ بێنێت و بۆ کردارەکە ئامادەم بکات، جەستەم هەڵچوو وەك بڵێی نەقالەکەم کارەبای کەوتووەتە سەر. بە تەوژمێکی گەورەی وزەوە، ناڵەیەکی

پڕ عەزابم دەرکرد کە پشتی کۆم کردمەوە و باسکەکانمی بە هەوادا راوەشاند. روخسارم سوور بوو و دەمارەکانی ملم بەشێوەیەکی شێتانە دەرپەڕیبوون. لۆرا هاواری کرد بۆ یارمەتیی زیاتر و پاشان بەزوویی دووان، ئینجا سیان و دواجار شەش ئامادەبوو لە تەقەلادا بوون بۆ ئەوەی بمگرن بۆئەوەی دکتۆرە کردارەکەی جێبەجێ بکات. ئەوان بەزۆر جەستەمیان خستە شێوەی کۆرپەلە لەکاتێکدا کە لۆرا بەنجی زیاتری بۆ دەکردم. دواجار، ئەوان توانیان بایی پێویست دامرکێننەوە بۆئەوەی دەرزییەکە ئاژنی بنی بڕبڕەم بکرێت.

لە کاتی هێرشی بەکتریادا، جەستە دەستبەجێ دەچێتە دۆخی بەرگرییەوە، لەشکرێك لە خڕۆکە سپییەکان لە رەبایەکانیانەوە لە سپڵ و مۆخی ئێسکەوە رەوانە دەکات. ئەمانە یەکەمین قوربانین لە شەڕی گەورەی خانەییدا کە روودەدات کاتێ تەنێکی بایۆلۆجیی دەرەکی جەستە داگیر دەکات و دکتۆرە پۆتەر دەیزانیی کە هەر ناڕوونییەك لە شلەی بڕبڕەمدا بەهۆی خڕۆکە سپییەکانی خوێنمەوە دروست دەبێت.

دکتۆرە پۆتەر چەمایەوە و سەرنجی خستە سەر مانۆمەترەکە، لوولەکێکی ستوونیی روون کە شلەی بڕبڕەی پشتی تیادا دەردەکەوێ. یەکەم سەرسوڕمانی بۆرا ئەوە بوو کە شلەکە دڵۆپە دڵۆپە نەهاتەخوار بەڵکو فیچقەی کرد– بەهۆی فشارێکی یەکجار بەرزی مەترسیدارەوە.

سەرسوڕمانی دووەم رواڵەتی شلەکە بوو. کەمترین لێڵی، پێی دەوت کە من لە کێشەیەکی گەورەدام. ئەوەی کە هاتە ناو مانۆمەترەکەوە جیڕ و سپی بوو لەگەڵ کەمێك سەوزاییدا.

شلەی بڕبڕەی پشتم پڕ بوو لە کێم و جەراحەت.

بەشی سێیەم

# لەناکاو

دکتۆرە پۆتەر دکتۆر (رۆبەرت برێنان)ی ئاگادار کردەوە، کە یەکێك بوو لە هاوکارەکانی لە نەخۆشخانەی گشتیی لینچبێرگ و پسپۆڕ بوو لە نەخۆشییەکان ئاوسان. لەکاتێکدا کە ئەوان چاوەڕوانیی ئەنجامی پشکنینی زیاتریان دەکرد لە تاقیگەکان دەورروبەر، هەموو ئەگەرەکانی نەخۆشی و شێوازەکانی چارەسەریان لەبەرچاو گرت.

خولەك دوای خولەك، لە کاتێکدا کە ئەنجامەکانی پشکنین هاتنەوە، من لەژێر شریتە توندکراوەکانی سەر نەقالەکەمەوە بەردەوام بووم لە ناڵە و پەلەقاژە. وێنەیەکی تەنانەت سەرسوڕهێنەرتر لە دەرکەوتندا بوو. پەڵەی گرام ( پشکنینێکی کیمیایی بەناوی پزیشکێکی دانیمارکیی داهێنەرەوە کراوە کە رێگە بۆ دکتۆرەکان خۆش دەکات بەکتریایەکی داگیرکەر بە گوێرەی گرام—نێگەتیف یان گرام پۆزەتیف پۆلێنبەندی بکەن) هاتەوە و گرام—نێگەتیڤی پیشاندا کە تا بڵێی دۆخێکی نائاسایی بوو.

لەهەمان کاتدا پشکنینی تۆمۆگرافی (CT)ی کەللەسەرم لە ڕێگەی کۆمپیوتەرەوە پیشانیدا کە ڕووپۆشە توێژاڵییەکانی مێشکم بەشێوەیەکی ترسناك هەڵاوسان. لوولەکێکی هەناسەدان خرایە ناو بۆری هەوام، بۆئەوەی پەمپی هەناسەدانی دەستکرد ئیشی هەناسەدانەکەم بۆ بکات- دوانزە هەناسە لە خولەکێکدا- و پاترییەکی مۆنیتەرەکان لە دەوری جێگاکەم جێگیر کرا بۆ تۆمارکردنی هەر جوڵەیەکی ناو جەستەم و مێشکی تەقریبەن نابووتم.

لەو ژمارە کەمەی پێگەیشتووان کە بەشێوەیەکی ڕەمەکی تووشی (مێنینجایتس)ی بەکتریایی دەبن (ئەوەش بەبێ نەشتەرگەریی مێشك یان چوونە ناو برینی سەر) لە هەر ساڵێکدا، بەزۆری بەهۆی هۆکارێکی دیارەوە تووش دەبن، وەکو لاوازی لە سیستەمی بەرگرییاندا (زۆرجار بەهۆی ئایدزەوە). بەڵام بەلام من هۆکارێکی وەهام نەبوو تا بەرانبەر نەخۆشییەکە هەستیارم بکات. بەکتریای تر لەوانەیە لە ڕێگەی داگیرکردنی کونە هاوسێیەکانی (کەللەسەر- لووت) یان گوێی ناوەڕاستەوە ببنەهۆی (مێنینجایتس) نەك ئی. کۆلی. بۆشایی دڕکەپەتك و مێشك زۆر بە باشی داخراوە لەبەرانبەر بەشەکەی تری جەستەدا کە ئەمە ڕوونەدات. ئەگەر بڕبڕەی پشت یان کەللەسەر کون نەبێت ( بۆ نموونە بە ئامێرێکی ژەهراوی بۆ ناو قووڵایی مێشك یان پارچەیەکی جێگیرکراو لەلایەن نەشتەرگەرێکی مێشك)، بەکتریای وەکو ئی. کۆلای کە بەزۆری لە هەناودا نیشتەجێن هەروا ناگەن بەو ناوچەیە. من خۆم سەدان ئامێر و پارچەم لە مێشکی نەخۆشەکاندا جێگیر کردووە و ئەگەر بمتوانیایە قسە لەسەر بابەتەکە بکەم، لەگەڵ دکتۆرە سەرسوڕماوەکانم هاوڕا دەبووم لەسەر ئەوەی کە نەخۆشییەکەم هەیە کە تەقریبەن مەحاڵە هەمبێت.

لە بارێکدا کە هێشتا نەیاندەتووانی بە تەواوی ئەو بەڵگەیەکە قبوڵ بکەن کە لە پشکنینەکانەوە دەرکەوتبوو، دوو دکتۆرەکان پەیوەندییان کرد بە شارەزایانی نەخۆشییە پەتاییەکان لە سەنتەرە پزیشکییە ئەکادیمییە گەورەکاندا. هەمووان لەسەر ئەوە کۆك بوون کە ئەنجامەکان ئاماژەن بە تاکە نەخۆشییەك.

بەڵام تووشبوون بە حاڵەتێکی توندی (مێنینجایتس)ی ئی. کۆلای ئاوا لەپڕ، تاکە کردارێکی پزیشکیی نامۆ نەبوو کە من لەو یەکەم رۆژەمدا لە نەخۆشخانە ئەنجاممدا. لە دوایین ساتەکاندا پێش جێهێشتنی ژووری ئیمێرجێنسی و پاش دوو سەعاتی رێك لە ناڵە و هاواری ئاژەڵ ئاسا لە بنی قورگەوە، دامرکامەوە. پاشان، هەر لەپڕێکا، بە سێ وشە هاوارێکم کرد. زۆر بە ڕوونی و هەموو دکتۆر و پەرستارەکانی ئەوێ بیستیان، هەروەها مۆڵی-ش کە چەند هەنگاوێ دوور وەستابوو، لە لایەکەی تری پەردەکەوە.

"خوایە، یارمەتیم بدە! "

هەمووان بەرەو نەقالەکە بەپڕتاو هاتن. لەو کاتەی کە گەیشتنە لام، بە تەواوی نوزەم لێبڕابوو.

هیچی ئەو کاتەم لەبیر نییە کە لە ژووری ئیمێرجێنسی بووم، لەوانەش ئەو سێ وشەیەی هاوارم کردن. بەڵام ئەمە دوایین وشە بوون بۆ ماوەی حەوت رۆژ.

بەشی چوارەم

# ئێبێنی چوارەم

جارێکیان لە بەشی سەرەکیی ژمارە یەك، بەردەوام بووم لە بەرەو نەمان. ڕێژەی گلوکۆزی شلەی بڕبڕەی پشتی کەسێکی تەندروستی ئاسایی نزیکەی (٨٠) میلیگرامە بۆ هەر دیسیلیتر*ێك. کەسێکی زۆر نەخۆش لە مەترسیی مردن بە (مێنینجایتس)ی بەکتریایی، دەشێ ڕێژەکەی تا ٢٠ میلیگرام بۆ هەر دیسیلیترێك نزم بێت.

ڕێژەی گلوکۆزی من ١ بوو. (پێوەری گلاسکۆ بۆ کۆما)م هەشت لە پانزە بوو، پیشاندەری نەخۆشییەکی توندی مێشك بوو و لە چەند ڕۆژی دواتردا زیاتر دابەزی. نمرەی ئاپاچی ٢ (پێوانەی توندیی نەخۆشی)م لە ژووری ئیمێرجێنسی ١٨ لە ٧١ بوو، پیشاندەری ئەوە بوو کە ئەگەرەکانی مردنم لەو داخڵکردنەدا نزیکەی ٣٠٪یە. بەشێوەیەکی دیاریکراوتر، بە لەبەرچاوگرتنی نەخۆشیی (مێنینجایتس)ی بەکتریایی توند و ئەو دابەزینە دەماریيە خێرایەی هەر لە سەرەتاوە هەمبوو، لەباشترین حاڵەتدا تەنیا ١٠٪ شانسی ئەوەم هەبوو کە لەو نەخۆشییە دەربازم بێت کاتێك

---

*یەك دیسیلیتر یەکسانە بە یەك لەسەر دەی لیتر.

داخلّی ئیمێرجێنسی کرام. ئەگەر ئەنتی بایۆتیکەکە کاریگەر نەبووایە، مەترسی مردن لە چەند رۆژی دواتردا زیاتر و زیاتر ەبوو– تا ئەوەی کە دەگەیشتە ئاستێکی بێ چەند و چونی ١٠٠٪.

دکتۆرەکان سێ بوتڵەئاوی ئەنتی بایۆتیکی بەهێزیان تێکردم پێش ئەوەی بمنێرنە ماڵە نوێکەم: ژوورێکی تایبەتی گەورە، ژمارە ١٠، لە یەکەی چاودێریی پزیشکیی ورد، نهۆمێك لە سەروو ژووری ئیمێرجێنسییەوە.

من وەکو نەشتەرگەر زۆرجار لەو یەکانەدا ئیشم کردووە. ئەمە ئەو شوێنانەن کە نەخۆشترین خەڵکانیان تێدا دەخەوێنرێن، ئەوانەی کە چەند سانتیمەترێك لە مەرگەوە دوورن، بۆئەوەی ژمارەیەك کارمەندی پزیشکی بتوانن لە یەك کاتدا کاریان لەسەر بکەن. تیمێکی وەها کە لە هەماهەنگییەکی تەواودا کۆشش دەکەن بۆ زیندووهێشتنەوەی نەخۆش کاتێك هیچ ئەگەرێك لە بەرژەوەندییاندا نییە، دیمەنێکی سەخت دەهێننە بەرچاو. من لەو ژوورانەدا هەم هەستم بە شانازییەکی گەورە کردووە و هەم بە نائومێدییەکی دڵڕەقانە، پەیوەست بەوەی کە ئاخۆ ئەو نەخۆشەی ئیشمان لەسەر کردووە رزگاری بووە یان لە دەستمان دەرچووە.

دکتۆر برێنان و دکتۆرەکانی تر ئەوەندەی توانیان بە گەشبینی مانەوە لای هۆڵی، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو بارودۆخەی کە لە ئارادابوو. دۆخەکەش هی ئەوە نەبوو بەهیچ شێوەیەك گەشبین بیت. راستییەکە ئەوە بوو کە لە ژێر مەترسییەکی گەورەی مردندا بووم، زۆر بە زوویی. تەنانەت ئەگەر نەشمردمایە، ئەو بەکتریایەی هێرشی دەکردە سەر مێشکم هەنوکە بایی پێویست (کۆرتێکس)ەی قوتدابوو کە سازش لەسەر هیچ چالاکییەکی بەشی سەرەوەی مێشك نەکات. چەندەی زیاتر لە

کۆمادا بمایەتمەوە، ئەوەندە ئەگەری زیاتر دەبوو کە پاشماوەی ژیانم لە دۆخێکی درێژخایەنی ڕووەك ئاسادا بمێنێتەوە (تەنیا لەش ئیش بکات).

خۆشبەختانە، نەك تەنیا ستاف نەخۆشخانەی گشتی لینچبێرگ بەڵکو خەڵکانی تریش، هەنوکە کۆ ببوونەوە بۆ یارمەتیدان. مایکڵ سولیڤان، دراوسێمان و راگری کڵێسای ئوسقوف، نزیکەی سەعاتێك پاش هۆڵی گەیشتە ژووری ئیمێرجێنسی. هۆڵی هەر کە دەرگاکەوە دەرپەڕیبووە دەرەوە بۆ وێڵبوون بەدوای ئامبولانسەکەدا، زەنگی تەلەفۆنەکەی لێیدابوو. ئەو کەسە هاوڕێ لەمێژینەکەی بوو (سیلڤیا وایت). سیلڤیا هەمیشە شێوازێکی سەیری هەبوو بۆ پەیوەندیکردن رێك لەو ساتانەدا کە شتێك روویدەدا. هۆڵی قەناعەتی وابوو کە ئەو کەسێکی رۆحییە. (من گەیشتبوومە روونکردنەوەیەکی سەلامەتتر و مەعقولتر لەبارەی ئەمە کە ئەو تەنیا پێشبینیکەرێکی زۆر باشە). هۆڵی سیلڤیای تێگەیاند لەوەی کە روویدەدا و ئینجا تەلەفۆنیان بۆ کەس و کاری نزیکم کرد: خوشکە بچوکەکەم ( بێتسی) کە هەر لەو نزیکانە دەژیا، (فیلیس)ی خوشکم هەر بچوکەکەمان کە تەمەنی چل و هەشت ساڵان بوو و لە (بۆستن) دەژیا و (جین) کە لە هەمووومان بەتەمەنتر بوو.

ئەو بەیانییەی دووشەممەیە جین لە ماڵەکەیەوە لە (دێلاوێر) بە رێگەی (ڤێرجینیا)دا بەرەو باشوور دەرۆیشت. بە رێکەوت، ئەو بە رێگاوە بوو بۆ یارمەتیدانی دایکمان کە لە (وینستن–سالەم) دەژیا. مۆبایلەکەی جین زەنگی لێدا. (دەیڤد)ی مێردی بوو.

پرسیاری کرد "هێشتا لە (ریچمۆند) تێپەڕیوویت؟ "

جین وتی "نا. بەڵام لەلای باکوورییەوە نزیکم"

""بچۆرە سەر جادەی ٦٠ی خۆرئاوا پاشان جادەی ٢٤ بەرەو لینچبێرگ. هۆڵی هەر ئێستا تەلەفۆنی کرد. ئێبێن لەوێ لە ژووری ئیمێرجێنسییە. ئەم بەیانییە تووشی نەوبە بووە و بێهۆشە".

"ئای خوایە! نازانن هۆکاری چیە؟ "

"ئەوان دڵنیا نین، بەڵام لەوانەیە (مێنینجایتس) بێت".

جین لەکاتی خۆیدا پێچی کردەوە و بە ڕێگای ٢٤دا گەیشتە لینچبێرگ.

ئەوە فیلیس بوو کە، لە سەعات سێی ئەو پاش نیوەڕۆیەدا تەلەفۆنی بۆ ئێبێنی چوارەم کرد لە شوقەکەی لە زانکۆی دێلاوێر. ئێبێن لە دەرەوە بوو و خەریکی ئەنجامدانی هەندێ واجبی زانستی بوو (باوکم نەشتەرگەری مێشك بوو و ئێستا ئێبێنیش گرنگی بەو پیشەیە دەدا) کاتێك زەنگی تەلەفۆنەکەی لێیدا. فیلیس زانیارییەکی خێرای بارودۆخەکەی پێ گەیاند و پێی وت نیگەران نەبێت- دکتۆرەکان هەموو شتێکیان کۆنترۆڵ کردووە.

ئێبێن پرسیاری کرد "دەزانن چیەتی؟ "

"ئەوەی ڕاستی بێت باسی بەکتریای گرام نێگەتیف و مێنێنجایتس-یان کردووە".

ئێبێن وتی، "لەو چەند ڕۆژەی دواتردا دوو تاقیکردنەوەم هەیە، بۆیە یەك دوو قسەی خێرا لەگەڵ مامۆستاکانم دەکەم".

ئێبێن دواتر پێی وتم لە سەرەتادا دوودڵ بووە لەوە بڕوا بکات من لەو مەترسییە گەورەیەدا بم کە فیلیس وتوویەتی، چونکە ئەو و هۆڵی هەمیشە "مێشیان کردووە بە گامێش"- و من قەت نەخۆش نەکەوتووم. بەڵام کاتێك مایکڵ سولیڤان سەعاتێك دواتر تەلەفۆنی بۆ کردووە، درکی بەوە کردووە کە دەبێ دەستبەجێ بکەوێتە ڕێ.

لەکاتێکدا کە ئێبێن بەرەو ڤێرجینیا کەوتووەتەڕێ، بارانێکی شڵتوشۆ بە قورسی دەستیپێکردووە. فیلیس سەعات شەش لە (بۆستن) دەرچووبوو و لەکاتێکدا کە ئێبێن رووبکردبووە پردی سەری رووباری (پۆتۆماك) بەرەو ناو ڤێرجینیا، ئەو گەیشتبووە (ریچمۆند)، ئۆتۆمبێلێکی بەکرێ گرتبوو و چووبووە ناو جاددەی ٦٠وە.

ئێبێن کاتێك چەند مایلێك لە دەرەوەی لینچبێرگ بوو، تەلەفۆنی بۆ هۆڵی کرد.

پرسیاری کرد " بۆند چۆنە؟ "

هۆڵی وتی "خەوتووە"

ئێبێن وتی "کەواتە من راستەوخۆ دەچمە نەخۆشخانە".

"دڵنیای ناتەوێ یەکەمجار بێیتەوەماڵەوە؟ "

ئێبێن وتی "نا. تەنیا دەمەوێ باوکم ببینم".

ئێبێن سەعات ١١: ١٥ی شەو گەیشتە یەکەی چاودێریی پزیشکیی ورد. رێڕەوی بەردەم نەخۆشخانە خەریك بوو دەیبەست و کاتێك هاتە بەر رووناکی گڵۆپەکانی ژووری پرسگە تەنیا پەرستارێکی پرسگەی شەوی بینی. ئەو رێنمایی کردبوو بەرەو پێخەفی یەکەی چاودێرییەکە.

لەو ساتەدا، هەموان پێشتر هاتبوون و رۆیشتبوونەوەش. تاکە دەنگێك لە ژوورە نیمچەرووناکە گەورەکەدا بیپە بیپ و فسە فسی ئەو مەکینانە بوون کە بەردەوامییان دەدا بە جەستەم.

ئێبێن کاتێك منی بینیبوو لە بەردەم دەرگاکە سڕ ببوو. لەو تەمەنەی بیست ساڵیدا، قەت منی بە حاڵەتێکی هەڵامەتەوە زیاتر نەبینیبوو. ئێستا، سەرباری هەموو ئەو مەکینانەی کە ئەوپەڕی کاری خۆیان ئەنجام دەدەن تا پێچەوانەکەی بێتە بەرچاو، ئەو دەیزانییە شتێك کە لە جەوهەردا لاشە بوو. جەستەی فیزیکیم لەوێ بوو لەبەردەمیدا، بەڵام ئەو باوکەی ئەو دەیناسی نەمابوو.

یان بە دەربڕینێکی باشتر: لە شوێنێکی تر بوو.

بەشی پێنجەم

# جیهانی ژێرەوە

تاریکی بوو، بەڵام تاریکییەکی بینراو- وەکو ئەوەی لە قوڕدا نقوم بووبیت بەڵام بتوانیت ببینیت. یان بڵێین جەلییەکی پیسبوو. شەفاف، بەڵام بە شێوازێکی شێواو، بەرتەنگ و خنکێنەر.

ئاگایی، بەڵام ئاگایی بەبێ مێمۆری (زاکیرە) یان شوناس- وەکو خەونێك کە تیایدا دەزانی چی لە دەورت دەگوزەرێ، بەڵام بەشێوەیەکی واقیعی نازانیت کێ یان چیت.

دەنگیش: بەرکەوتنێکی قووڵی هاوئاهەنگ، دوور بەڵام بەهێز، وەك بڵێی هەر لێدانێك رێك بە تۆدا رەت دەبێ. وەکو دڵەخورپە؟ کەمێك، بەڵام شاراوەتر، زیاتر میکانیکی- وەکو دەنگی بەرکەوتنی ئاسنێك بەر ئاسنێکی تر، وەك بڵێی ئاسنگەرێکی ژێر زەوی لە شوێنێکی دوورەوە ئاسن دەکوتێت: ئەوەندە بە توندی دەیکوتێت کە دەنگەکە بە زەویدا، یان بە قوڕدا یان هەرکوێیەك کە تۆی لێیت دەزرنگێتەوە.

من جەستەم نەبوو- هەرچۆنێك بێ ئەوەیانم نەبوو کە پێی بزانم. هەر. . . لەوێ بووم و هیچی تر، لەو شوێنەی لێدانی، بەرکەوتنی تاریکایی. لەو کاتەدا، لەوانەیە من بە "بەرایی" ناوم ببردایە. بەڵام لەو سەروەختەدا درێژەی هەبوو، ئەو وشەیەم

نەدەزانی. لە راستیدا، هیچ وشەیەکم نەدەزانی. ئەم وشانەی لێرە بەکارهێنراون زۆر دواتر تۆمار کراون، کاتێك، بە گەڕانەوەم بۆ جیهان، بیرەوەرییەکانم دەنووسینەوە. زمان، هەست، لۆژیك: ئەمانە هەمووی رۆیشتبوون، وەك بڵێی گەڕابوومەوە بۆ دۆخێکی بوون لە هەرە سەرەتای ژیاندا، بە قەد دوورایی زەمانی، با بڵێین، بەکتریا بەرایییەکان کە بەبێ ئەوەی بزانم مێشکیان گرتبووم و لەکاریان خستبوو.

ماوەی چەند لەم جیهانەدا مامەوە؟ نازانم. کاتێك تۆ دەچیتە شوێنێك کە بەو شێوەیەی لە جیهانی ئاساییدا ئەزموونی دەکەین هەستکردن بە کات نییە، باسکردنی بەو وردییە تەقریبەن مەحاڵە. کاتێك کە روویدەدا، کاتێك لەوێ بووم، من (جا من هەرچییەك بێت) هەستم دەکرد هەمیشە لەوێ بووم و هەر لەوێ دەبم.

ئەمە بەلاشمەوە گرنگ نەبوو، لانی کەم لەسەرەتادا. بۆچی دەبێ بەلامەوە گرنگ بووبێت، چونکە بەم دۆخەی بوون تاکە دۆخێك بوو تاوەکو ئەو کاتە زانیبێتم؟ من کە یادەوەریم لە هیچ شتێکی باشتر نەبوو، بەشێوەیەکی دیاریکراو سەغڵەت نەبووم بەوەی ئەبێ لە کوێ بم. وێنای ئەوەم لە یادە کە لەوانەیە یان لەوانە نییە لەژیاندا بمێنمەوە، بەڵام بێباکیم لەوەی ئاخۆ مامەوە یان نەمامەوە هەستێکی گەورەتری سەلامەتی پێ نەبەخشیم. من هیچم لەو یاسا و رێسایانە نەدەزانی کە لەم جیهانەی تیایدابووم هەبوون، بەڵام پەلەم نەبوو لە زانینیان. دواجار بۆ دەبێ خۆم سەغڵەت بکەم بەمەوە؟

نازانم دەقاودەق کەی روویدا، بەڵام لە ساتێکی دیاریکراودا لە هەندێ شتی دەوروبەرم بەئاگاهاتم. کەمێك وەکو رەگ و ریشە بوون، کەمێکیش وەکو بۆڕی خوێن بوون لە مناڵدانێکی قوڕاوی گەورەدا. لەبارێکدا کە لە رەنگێکی سووری چڵکنی هەوشانەوە، لەسەری سەرەوەی شوێنێکەوە دابەزینە خواری خوارەوە.

له بەرانبەردا، سەیرکردنیان وەکو ئەوە وابوو کوێرەموش یان کرمی زەوی بێت و لە قووڵایی زەویدا بێت لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەك لە شێوەکان بتوانێت بەرجەستەبووی لوولی رەگەکان و درەختەکانی دەوریان ببینێت.

هەربۆیە، دواتر کە بیرم لەو شوێنە دەکردەوە، بە ناوچەی روانگەی چاوی کرم ناوم برد، وای بۆچووم کە جۆرێك یادەوەری بێت لەوەی مێشکم هەستی پێکردووە کاتێك بەکتریا بەسەریدا زاڵ ببوو.

بەڵام چەندەی زۆر بیرم لەو روونکردنەوەیە کردەوە (و جارێکی تر، ئەمە زۆر دواتر بوو) کەمتر مانای هەبوو. چونکە- وەکو چۆن ئەمە سەختە بۆ ئێوە وێنای بکەن کە خۆتان لەوێ نەبووبن- کاتێك لەوێ بووم ئاگاییم تەماوی یان شێواو نەبوو. تەنیا. . . سنووردار بووم. مرۆڤ نەبووم کاتێك لەو شوێنە بووم. تەنانەت ئاژەڵیش نەبووم. شتێ بووم لە، خوارەوە، و پێش هەموو ئەوانە. تەنیا تاکە خاڵێکی هۆشیاری بووم لە دەریایەکی قاوەیی سووربای دەرەوەی کات.

چەندەی زۆر لەم شوێنە مامەوە، کەمتر هەستم بە نائاسودەیی کرد. یەکەم جار ئەوەندە قووڵ چووبوومە ناویەوە کە جیاوازی نەبوو لەنێوان "خۆم" و ئەو شتە نیوە نامۆ، نیوەئاشنایەی لە دەورم بوو. بەڵام پەیتا پەیتا، ئەم دۆخەی چوونەناوە قووڵە، نازەمەنییە بێ سنوورە شوێنی بۆ شتێکی تر چۆڵ کرد: هەستکردن بەوەی کە بە راستی بەشێك نیم لەم جیهانە ژێرزەمینییە، بەڵکو گیرم تیایدا خواردووە.

روخساری سەیر و سەمەرەی ئاژەڵ لە قوڕەکە دەرپۆقین، ناڵاندیان یان زیقاندیان و پاشان دیسان رۆیشتن. نەڕەی ناوبەناوی کپم دەبیست. هەندێ جار ئەو نەڕانە دەبوونە هوتاف بە ڕیتمی تەمومژاوی، ئەو هوتافانەی کە هەم تۆقێنەر و هەم بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن ئاشنا بوون- وەك بڵێی لە ساتێك لە ساتەکاندا خۆم زانیوومن و وتوومن.

لەکاتێکدا کە یادەوەریم لە ئەزموونی پێشووم نەبوو، کاتم لەم ناوچەیەدا زۆر درێژ بووەوە. چەند مانگێك، چەند ساڵێك؟ ، تاهەتایە؟ بە چاوپۆشیکردن لە وەڵامەکە، دواجار گەیشتمە خاڵێك کە هەستی کرم ئاسام بە تەواوی زاڵ بوو بەسەر هەستە ئاشناکەمدا. چەندەی زیاتر هەستم بکردایە کە "خۆم"م – وەکو شتێك کە جودایە لە دەوروبەری سارد، تاریك و تەڕم– ئەوەندە زیاتر ئەو روخسارانەی لە تاریکییەوە دەیردەچوون قێزەونتر و ترسێنەرتر دەبوون. دەنگی بەرکەوتنە هاوئاهەنگەکەی دوورایییەکەش توندتر و چڕتر دەبووەوە– ببووە ئیشی تەپڵ کوتانی جۆرە لەشکرێکی کرێکاری غول ئاسای ژێر زەوی کە ئەرکێکی لەڕادەبەدەر هاوئاهەنگی بێ کۆتایان جێبەجێ دەکرد. جوڵەی دەوروبەرم بینایییەکەی کەمتر بووەوە و زیاتر بوو بە هەستی، وەك بڵێی گیانەوەری وەکو مارمێلك و کرم بەکۆمەڵ تێدەپەڕین و ناوبەناو بە پێستە نەرم یان دڕکاوییەکەیان لەمن دەخشان.

پاشان بۆنێکم کرد: کەمێك وەکو پیسایی، کەمێك وەکو خوێن و کەمێك وەکو رشانەوە. بە دەربڕینێکی تر بۆنێکی بایۆلۆژی، بەڵام مەرگێکی بایۆلۆژی، نەك ژیانێکی بایۆلۆژی. لەکاتێکدا کە ئاگاییەکەم زیاتر و زیاتر دەبوو، زیاتر بە تۆقین نزیك دەبوومەوە. هەرکەسێك یان هەر شتێك بم، پەیوەندیم بە ئێرەوە نییە. دەبێ دەرچم. بەڵام بۆ کوێ؟

تەنانەت کاتێك ئەم پرسیارەم کرد، شتێکی تر لە تاریکاییەکەی سەرەوە دەرکەوت: شتێك کە سارد، یان مردوو، یان تاریك نەبوو، بەڵکو پێچەوانەی هەموو ئەمانە بوو. ئەگەر لە تەواوی پاشماوەی ژیانمدا هەوڵم بدایە، ئەوا قەت نەمدەتووانی حەقی خۆم بدەم بە باسکردنی چەندێتیی جوانیی ئەو بوونەوەرە کە ئێستا لێم نزیك دەبووەوە. . .

بەڵام هەوڵ دەدەم ئەمە بکەم.

بەشی شەشەم

# لەنگەری ژیان

فیلیس کەمتر لە دوو سەعات پاش ئێبێنی چوارەم گەیشتە گەراجی نەخۆشخانە، لە دەوروبەری ١ی بەیانیدا. کاتێك گەیشتە ژووری یەکەی چاودێرییەکەم بینی ئێبێن لە تەنیشت پێخەفەکەم دانیشتووە، توند دەستی بە سەرینێکی بەردەمییەوە گرتووە بۆئەوەی خەو نەیباتەوە.

ئێبێن بە دەنگێکی ماندوو و نیگەرانەوە وتی، "دایکم لەماڵەوەیە لەگەڵ بۆند" و دڵخۆش بوو کە لە پڕ ئەوی بینیبوو.

فیلیس بە ئێبێن-ی وت کە پێویستە بچێتە ماڵەوە، ئەگەر بە درێژایی شەو بێدار بێت پاش ئەو هەموو رێگابڕینە لە (دێلاوەر)ەوە ئەوا بۆ سبەینێ کەڵکی بۆ کەس نابێ، تەنانەت بۆ باوکیشی. فیلیس تەلەفۆنی بۆ هۆڵی و جین کرد لە ماڵەکەمان و پێیانی وت ئێبێنی چوارەم بە زوویی دێتەوە بەڵام ئەم ئەو شەوە لە ژوورەکەی من دەمێنێتەوە.

کاتێك تەلەفۆنەکەی داخستەوە بە ئێبێنی چوارەمی وت "بڕۆرە ماڵەوە لای دایکت و پورت و براکەت. ئەوان پێویستیان پێتە. کاتێك سبەینێ دێیتەوە باوکت و من هەر لێرە دەبین".

ئێبێنی چوارەم روانیە جەستەی من: لولەکە پلاستیکییە روونەکەی هەناسەدان کە بە لای راستی لووتمدا بەرەو بۆڕی هەوام ڕەت دەبوو ، لێوە تەنکەکانم کە هەنوکە وشکهەڵاتبوون، چاوە داخراوەکان و ماسولکە چرچبووەکانی روخسارم.

فیلیس پەی بە بیرکردنەوەی ئەو برد.

"ئێبێن بڕۆرەماڵەوە. هەوڵدە نیگەران نەبیت. باوکت هێشتا لەگەڵمانە. منیش ناهێڵم بڕوا"

فیلیس هاتە لای جێگاکەم، دەستمی گرت و دەستیکرد بە ماساژ کردنی. بە تەنیا لەگەڵ مەکینەکان و پەرستاری شەو کە هەموو سەرەسەعاتێك دەهات چێکی ئامارەکان بکات، فیلیس لە تەواوی ئەو شەوەدا دانیشت، دەستی دەگرتم، دەیویست ئەو پەیوەندییە بهێڵێتەوە کە دڵنیابوو چالاکە ئەگەر من هەستابامایەتەوە.

قسەیەکی سواوە ئەگەر باس لەو گرنگییە گەورەیە بکەیت کە خەڵکی باشوور بە خانەوادەی دەدەن، بەڵام وەکو زۆرێك لە قسە سواوەکانی تریس، راستە. کاتێك لە ١٩٨٨دا چوومە هارڤارد، یەکێك لەو شتە سەرەتاییانەی لەبارەی خەڵکانی باکوور تێبینیم کرد، ئەوە بوو کە کەمێك شەرمنترن لە دەربڕینی ئەو راستییەی کە زۆرێك لە خەڵکانی باشوور بە ئاسایی لێیان دەڕوانی: خانەوادەکەت بریتییە لە تۆ.

بە درێژایی ژیانم، پەیوەندیم لەگەڵ خانەوادەکەمدا– لەگەڵ دایك و باوکم و خوشکەکانم و دواتر لەگەڵ هۆڵی، ئێبێنی چوارەم و بۆند– هەمیشە سەرچاوەیەکی زیندووی توانام و هێزم بووە، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا تۆکمەتریش بوو. خانەوادە ئەو شوێنە بوو کە رووم تێدەکرد بۆ پشتگیریی بێ چەندوچون لە جیهانێکدا کە دەشێ– باکوور یان باشوور– زۆرجار لەم پێداویستیەیان کەم بێ.

من و هۆلّی و منالّەکان تەنیا لە بۆنەدا دەچووینە کلّێسای ئوسقوفییەکەمان. بەلاّم راستییەکەی ئەوە بوو کە بۆ چەند سالّێك هەنگاوێك لە پێش ئەوانەوە بووم کە تەنیا لە کریسمەس و یادی مەرگ و هەستانەوەی عیسا دەچوونە کلّێسا (ئەو کەسەی کە تەنیا لەو دوو بۆنەیەدا دەرگای کلّێسایان دەکردەوە). من هانی منالّەکانم دەدا کە لە شەودا نزاکانیان بکەن، بەلاّم من رێبەری ئایینی نەبووم لە مالّەوەمان. هەرگیز لەو هەستە قوتار نەبووم کە دەبێ نزای وەها بە راستی چۆن بن. چەندەی لە گەشەکردنمدا ویستی ئەوەم هەبوو بڕوا بە خودا و ژیانی دوای مەرگ بهێنم، ئەو دوو دەیەی لە جیهانی وردەکاری زانستیی نەشتەرگەری مێشك بەسەرم برد بەشێوەیەکی قوولّ خرابوونە ژێر پرسیاری ئەمەی کە چۆن شتی وەها دەشێ بوونیان هەبێ. زانستی مۆدێرنی مێشك و دەمار دەلّێت مێشك دەبێتەهۆی سەرهەلّدانی ئاگایی– ئەقلّ، گیان، رۆح هەر شتێکی تر کە تۆ بەو بەشە نەبینراو، نامادديیەی مرۆڤ بلّێیت کە بە راستی دەمانکاتە ئەوەی کە هەین – و تەقریبەن هیچ گومانێکم نەبوو کە ئەوە راستە.

وەکو زۆربەی کارمەندانی بواری چاودێریی تەندروستی کە راستەوخۆ لەگەلّ نەخۆشی روو لەمردن و کەس و کاریان هەلّسوکەوت دەکەن، بە درێژایی سالاّنێك لەبارەی هەندێ رووداوەوە بیستبووم –و بینیبووشم– هەندێ رووداوەی تەواو نارِوون. ئەمانەم لەژێر سەرناوی "نەزانراو" و لێیان گەڕێ با وابن، تۆمار کردبوو و وەلاّمێکی باوم بۆ دەدۆزینەوە.

بەو مانایەش نییە کە من دژی بیروباوەڕە ناسروشتییەکان بووم. وەکو دکتۆرێك کە زوورزوو ئێش و ئازاری جەستەیی و هەستی دەبینی، دوایین شت کە ویستوومە

بیکەم، نکوڵیکردن بووە لەو ئاسودەیی و ئومێدەی ئیمان دابینی دەکرد. لە ڕاستیدا، حەزم دەکرد خۆم کەمێکم لێی هەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، چەندەی بەتەمەندا چووم، ئەگەری ئەمە کەمتر بووەوە. وەکو ئۆقیانووسێك کە کەناراو ڕادەماڵێت، بە تێپەڕینی ساڵان، جیهانبینیی زانستیم لەسەرخۆ بەڵام بە بەردەوامی توانامی بۆ بڕواهێنان بە شتێکی مەزنتر لاواز کرد. پێدەچوو زانست بڕێکی بێشوماری بەڵگە دابین بکات کە گرنگی ئێمەی لە گەردووندا نزیکی سفر دەکردەوە. باوەڕ زۆر خۆش دەبوو. بەڵام زانست حەقی ئەوەی نییە چ خۆشە. تەنیا بایەخ بەوە دەدات کە هەیە.

من فێرخوازێکی خاوم، واتە ڕێك بە کردن فێر دەبم. ئەگەر خۆم هەست بە شتێك نەکەم یان خۆم دەستی لێ نەدەم، ئەوا قورسە بایەخی پێبدەم. ئەو ئارەزووە بوو بۆ دەست لێدان و هەستپێکردن بۆ لێتێگەیشتنی شتێك کە، وەکو باوکم ببمە نەشتەرگەری مێشك. مێشکی مرۆڤ چەندە ئەبستراکت (مجرد)ە، بەهەمان شێوە بێ سنوور کۆنکریتیشە.

وەکو خوێندکارێکی پزیشکی لە (دیوك)، خۆشیم دەبینی لە ڕوانینە ناو مایکرۆسکۆپێك و بەشێوەیەکی واقیعی بینینی ئەو دەمارەخانانەی بە ناسکی درێژ بوونەتەوە کە ئەو ڕایەڵە دەمارییانەیان لێ دەردەچێت کە دەبنەهۆی پەیدابوونی ئاگایی. کەیفم دەهات بە تێکەڵەی زانینی ئەبستراکت و ئەو ماددیبوونە (فیزیکبوونە) تێکڕاییەی نەشتەرگەریی مێشك دەیخستەڕوو. بۆ گەیشتن بە مێشك، پێویستە تۆ توێخەکانی ئەو پێست و شانەیە لابیەیت کە کەللەسەر دادەپۆشن و ئامێرێکی هەوایی خێرایی بەرز بەکاربێنیت کە پێی دەوترێت دڕێلی (میداس

ریکس). ئەمە ئامێرێکی تا بڵێیت ئاڵۆزکاوە، هەزاران دۆلاری تێدەچێت. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك تۆ دەچیتە سەری، تەنیا. . . درێلێکە.

بەهەمان شێوە، بەشێوەیەکی نەشتەرگەرییانە چاککردنی مێشك، لەکاتی پرۆسەیەکی سەرووئاسایی ئاڵۆز، بە راستی جیاوازی نییە لەگەڵ چاککردنی مەکینەیەکی کارەبایی وردەکار. من بە تەواوی دەزانم کە مێشك بە راستی چییە: مەکینەیەك کە دیاردەی ئاگایی بەرهەم دێنێت. بە دڵنیاییەوە، زاناکان نەیانتووانیبوو کتومت ئەوە بدۆزنەوە کە چۆن دەمارەخانەکانی مێشك ئەمە کارە ئەنجام دەدەن، بەڵام تەنیا مەسەلەی کات بوو پێش ئەوەی بیدۆزنەوە. ئەمە لە ژووری نەشتەرگەریدا هەموو رۆژێك دەسەلمێنرا. نەخۆشێك بە سەرئێشەوە و ئاگایی دابەزیووەوە دێتەژوور. تۆ وێنەیەکی (ئێم ئار ئای) بۆ مێشکی دەکەیت و وەرەمێك دەدۆزیتەوە. تۆ نەخۆشەکە دەخەیتە ژێر بەنجی گشتییەوە، وەرەمەکە لا دەبەیت و پاش چەند سەعاتێك جارێکی تر بە رووی جیهاندا بێدار دەبێتەوە. چیتر سەرئێشەی نییە. چیتر گرفتی ئاگایی نییە. لە رواڵەتدا هەروا سادەیە.

من کەیفم بەو سادەییە دەهات– خاوێنی و راستگۆیی رەهای زانست. رێزم هەبوو بۆئەوەی کە هیچ بوارێکی نەهێشتەوە بۆ فەنتازیا یان بۆ بیرکردنەوەی پڕوپوچ. ئەگەر بکرایە راستییەك وەکو بەرجەستە و جێ متمانە دەستنیشان بکرێت، ئەوا قبوڵ دەکرا. ئەگەر نا، ئەوا رەت دەکرایەوە.

ئەم روانگەیە بوارێکی کەمی هێشتەوە بۆ رۆح و گیان، بۆ بوونی بەردەوامی کەسایەتییەك پاش ئەوەی ئەو مێشکەی پاڵپشتی کردووە، لە کار وەستاوە. تەنانەت ئەمە بوارێکی کەمتری هێشتەوە بۆ ئەو وشانەی کە لە کڵێسا دەمبیست و دەمبیستنەوە: "ژیانێکی تاهەتایی".

هەربۆیە زۆر پشتم بە خانەوادەکەم بەستبوو- بە هۆڵی و کوڕەکانمان و سێ خوشکەکەم و بێگومان دایك و باوکیشم. بە مانایەکی راستەقینە، هەرگیز نەمتووانیووە مومارەسەی پیشەکەم بکەم- هەموو رۆژێ ئەو کردارانە جێبەجێ بکەم کە کردوومن و ئەو شتانە ببینم کە بینیومن- بەبێ پشتیوانیی بناغەداری ئەو خۆشەویستی و لێتێگەیشتنەی فەراهەمیان کردووە.

هەربۆیەش فیلیس (پاش راوێژکردن لەگەڵ خوشکەکەمان، بێتسی، بە تەلەفۆن) ئەو شەوە بڕیاریدا لەبری هەموو خانەوادەکەمان بەڵێنێکم پێبدات. لەکاتێکدا کە ئەو لە تەکمەوە دانیشتبوو و دەستە بێهێز و تەقریبەن مردووەکانی لەناو دەستی نابوو، پێی وتم گرنگ نیە لەمەودوا چی روودەدات، کەسێك هەر لەوێ دەبێ کە دەستەکانم دەگرێت.

ئەو وتی "ئێمە ناهێڵین بڕۆیت، ئێبێن. تۆ پێویستت بە لەنگەرێکە لێرە ، لەم جیهانەدا بتهێڵێتەوە، کە تیایدا پێویستمان پێتە. ئێمەش دابینی دەکەین".

ئەو کەمی دەزانی لەبارەی ئەوەی کە ئەو لەنگەرە چەند گرنگی خۆی لە چەنێك رۆژی دواتردا دەردەخست.

بەشی حەوتەم

# ئاوازی غەزەلەکە و دەروازەکە

شتێك لە تاریکیدا دەرکەوتبوو.

بە لاکردنەوە بە هێواشی، رووناکیی ئاڵتونی سپی باوی لێ دەدرەوشایەوە و بەم کردارەی، تاریکایی دەورم دەستیکرد بە پەرش و دابەش بوون. ئینجا دەنگێکی نوێم بیست: دەنگێکی زیندوو، وەکو چڕوپڕترین، ئاڵۆزترین و جوانترین پارچە مۆسیقایەك کە تاوەکو ئەو کاتە بیستبێتت. دەنگەکە زیادی دەکرد لەکاتێکدا کە رووناکییە سپییە بێگەردەکە دادەبەزی، بەرکەوتنە میکانیکییەکە هاوئاهەنگەکەی دادەپۆشی کە بۆ ماوەیەکی درێژ، تاکە هاوڕێم بوو تاوەکو ئەو کاتە.

رووناکییەکە نزیکتر و نزیکتر بووەوە، هەر دەسوڕایەوە و دەسوڕایەوە و ئەو تیشکانەی رووناکیی سپیی بێگەردی بەرهەم دەهێنا کە من ئێستا دەمبینی لەگەڵ تنۆکی ئاڵتونیدا ئاوێتە دەبوون. پاشان لە چەقی رووناکییەکەدا، شتێکی تر دەرکەوت. بەوپەڕی تەقەلاوە هۆشم چڕ کردەوە، هەوڵمدا بزانم ئەوە چییە.

کرانەوەیەك. چیتر نەمدەڕوانییە رووناکییە لەسەرخۆ سوڕاوەکە، بەڵکو دەمڕوانییە ناوی.

ئەو ساتەی کە لەوە تێگەیشتم، دەستم کرد بە جوڵە بەرەو سەرەوە. دەنگی گیڤەیەك هات و لە چاوتروکانێکدا بەناو کرانەوەکەدا رۆیشتم و خۆم لە جیهانێکی تەواو نوێدا دۆزییەوە. نامۆترین، جوانترین جیهانێك کە تاوەکو ئەو کاتە بینیبێتم.

کاریگەر، پڕ وزە و ژیان، تامەزرۆبەخش و سەرسامکەر. . . دەمتووانی ئاوەڵناو لەدوای ئاوەڵناو ریز بکەم بۆ وەسفکردنی چۆنایەتیی ئەو جیهانە، بەڵام هەموویان کورتیان دەهێنا. هەستم دەکرد لەدایك بوومەتەوە، نەك لەدایك بوومەتەوە یان جارێکی تر هاتوومەتە دنیاوە. بەڵکو . . . لەدایك بووم.

لە خوار منەوە دێهاتێك بوو. سەوز و چڕ و وەکو زەوی وابوو. زەوی بوو. . . بەڵام لەهەمان کاتدا زەوی نەبوو. ئەو کاتە بوو کە کاتێك دایك و باوکت دەتبەنەوە بۆ شوێنێك کە تیایدا چەند ساڵێکی منالّیت تیادا بەسەر بردووە. شوێنەکە نازانیت، یان لانی کەم پێت وایە نازانیت. بەڵام کە چاو دەگێڕیت، شتێك لێت دەدات، و درك بەوە دەکەیت کە بەشێك لە تۆ- بەشێکی قووڵایی ناخت- دواجار شوێنەکەی دێتەوە یاد و خۆشی دەبینێ لەو گەڕانەوەیە.

من دەفریم، بەسەر درەخت و کێڵگەکاندا، جۆگەلە و تاڤگەکاندا، ئێرە و ئەوێدا، خەڵکدا رەت دەبووم. منالّیشی لێبوون، پێدەکەنین و یارییان دەکرد. خەڵکی گۆرانییان دەوت و بەشێوەی بازنەیی سەمایان دەکرد و هەندێ جار سەگێکم دەبینی لەناویاندا رایدەکرد و بازی دەدا، وەکو خەڵکەکە پڕ بوو لە شادی. جلی سادە بەڵام جوانیان لەبەردابوو و وا دەهاتە بەرچاوم کە رەنگی ئەو جلانە هەمان ئەو گەرم و گوڕییەی درەختەکان و گوڵەکانیان هەیە کە لە دیهاتەکەی دەوریان شکۆفە و چرۆیان کردبوو.

جیهانێکی خەونی بێهاوتا و جوان. . .

ئەوە نەبێ کە خەون نەبوو. هەرچەندە نەمدەزانی لە کوێم یان تەنانەت چیم، لە یەك شت بە تەواوی دڵنیا بووم: ئەو شوێنەی کە لەپڕ خۆم تیادا بینییەوە بە تەواوی واقعی بوو. وشەی (واقیعی) گوزارشت لە شتێکی ئەبستراکت دەکات و بەشێوەیەکی نائومێدکەرانە ناچالاکە لە گەیاندنی ئەو شتەی دەمەوێ وەسفی بکەم. وێنای ئەوە بکە منالێکیت و لە رۆژێکی هاویندا دەچیتە سەیری فیلمێکی سینەمایی. لەوانەیە فیلمەکە باش بووبێت و خۆشیت لێ بینیووە کاتێك دانیشتوویت تەماشات کردووە. پاشان فیلمەکە کۆتایی هاتووە و پاشان لە سینەماکە هاتوویتە دەرەوە و گەڕاویتەوە ناو گەرم گوڕیی زیندوو و ئاسودەبەخشی پاش نیوەڕۆی هاوین. کاتێکیش هەوا و خۆرەتاو لێیداویت، بیرت لەوە کردووەتەوە ئاخۆ بۆچی ئەو رۆژەت جوانەت بە دانیشتن لەو سینەما تاریکەدا لەکیس خۆت داوە.

ئەو هەستە کەڕەتی هەزاران بکە و هێشتا نزیك نابیت لەو هەستەی من هەمبوو لەو شوێنەی کە لێی بووم. کتومت نازانم چەنێك فڕیم. (کات لەوێ جیاواز بوو لەو کاتە راستەهێڵییەی لەسەر زەوی ئەزموونی دەکەین و بەشێوەیەکی دەستەوستانکەر وەکو هەموو لایەنێکی تری سەختە بۆ وەسفکردن). بەڵام لە خاڵێك لە خاڵەکاندا، بۆم دەرکەوت کە من لەوێ تەنیا نیم.

کەسێك لە تەکمەوە بوو: کچێکی جوان بە کوڵمەی بەرز و چاوی شینی تۆخەوە. ئەویش هەمان ئەو جلە شێوە جوتیارییەی ئەو خەڵکانەی دێهاتەکەی خوارەوەی پۆشیبوو.

کەزییە رەنگ قاوەیی-ئاڵتونییەکان دەوری روخسارە دڵگیرەکەی دابوو. ئێمە لەسەر روویەکی ئاڵۆز پێکەوە دەڕۆیشتین، کە رەنگی وەسفنەکراو و زیندووی

تێچرژابوو– باڵی پەپولە. لە راستیدا ملیۆنان پەپولە لەدەورمان بوون– شەپۆلی پڕ لەرەی ئەو پەپوللانە دادەبەزیە ناو سەوزاییەکە و جارێکی تر دەهاتەوە دەوری ئێمە. تاکە پەپولەیەکی جودا نەبوو کە دەردەکەوت، بەڵکو هەموویان پێکەوە، وەك بلێی رووبارێك بوون لە ژیان و ڕەنگ و بەناو هەوادا دەجوڵان. ئێمە لە بازنەی داخراوی شلدا ئەفڕین و بە تەنیشت چرۆ و خونچەکانی سەر ئەو درەختانەدا رەت دەبووین کە کاتێك لێیان نزیك دەبووینەوە دەکرانەوە.

جلی کچەکە سادە بوون، بەڵام رەنگەکانی– شینی ئاوی، مۆر و پرتەقاڵی چڵکن – هەموو ئەو زیندووییەتییە بێ هاوتایەیان هەبوو کە هەموو شتەکانی دەوروبەر هەیانبوو. ئەو بە نیگایەکەوە سەیری کردم کە، ئەگەر بۆ چەند ساتێك لێت بڕوانیایە، هەموو ژیانتی تاوەکو ئەو ساتە دەنرخاند، گرنگ نییە تاوەکو ئەو کاتە چی تیادا روویداوە. نیگای هاوڕێیەتی نەبوو. روانینێك بوو لەسەروو هەموو ئەمانەوە. . . لەسەروو هەموو جۆرە جیاوازەکانی ئەو خۆشەویستییەی کە ئێمە لەسەر زەوی هەمانە. شتێکی باڵاتر بوو، هەموو ئەو جۆرە خۆشەویستییانەی تری لەخۆیدا هەڵگرتبوو کەچی لەهەمان کاتدا لە هەموویان رەسەنتر و بێگەردتر بوو.

بەبێ بەکارهێنانی هیچ وشەیەك دەستیکرد بە قسە لەگەڵما. پەیامەکە وەکو بایەك پیامدا تێپەڕی و دەستبەجێ تێگەیشتم کە راستە. وەکو چۆن دەمزانی جیهانی دەوروبەرمان واقیعییە ئاواش دەمزانی کە ئەوەش راستە– خەیاڵ نەبوو، راگوزەر و نابەرجەستە بێت.

پەیامەکە سێ بەش بوو و ئەگەر وەریبگێڕم بۆ زمانی سەر زەوی، شتێك وەکو ئەوەی خوارەوە بوو:

"تۆ خۆشەویست و بەڕێزیت، تاهەتایە"

"پێویستت ناکات لە هیچ بترسیت".

"هیچ شتێك نییە کە هەڵەی تیا بکەیت"

پەیامەکە خستمیە بەر ئۆقرەگرتنێکی گەورە و شێتانە. وەکو ئەوە وابوو ڕێساکانی گەمەیەکم بدرێتە دەست کە بەدرێژایی ژیانم کردوومە بەبێ ئەوەی بە تەواوی تێیبگەم.

کچەکە جارێکی تر وتی، "ئێمە گەلێك شتت لێرە پیشان دەدەین"، بەبێ ئەوەی بە راستی ئەو وشانە بڵێت بەڵام لە ڕێگەی گەیاندنی جەوهەری مەفهومەکە بە من بەشێوەیەکی راستەوخۆ. "بەڵام سەرەنجام، تۆ دەگەڕێیتەوە".

بۆ ئەمە تەنیا پرسیارێکم هەبوو.

گەڕانەوە بۆ کوێ؟

بیرت بێ کە ئێستا لەگەڵ کێدا دەدوێیت. من کەسێکی عاتیفی کەللەپوت نیم. دەزانم مردن چۆنە. دەزانم چ هەستێك دەبەخشێ کەسێکی زیندوو، کە لە ڕۆژە خۆشەکاندا قسەت و نوکتەت لەگەڵ کردووە، ببێتە کەرەستەیەکی مردوو لەسەر مێزی نەشتەرگەری پاش ئەوەی چەندەها سەعات لە ململانێدا بوویت بۆئەوەی ماکینەی جەستەی لەکاردا بهێڵیتەوە. دەزانم ئێش و ئازار و خەفەتی بێ وەڵامی سەر ڕوخساری کەس و کاری پەرۆش کە کەسێکیان لەدەستداوە کە هەرگیز خەویشیان پێوە نەبینیووە کە لە دەستی بدەن. من بایۆلۆجیی خۆم دەزانم و هەرچەندە فیزیاناس نیم، لەمەشدا نەشارەزا نیم. من جیاوازی نێوان فەنتازیا (خەیاڵ) و واقیع دەزانم و دەزانم ئەو ئەزموونەی کە لە هەوڵدام لێڵترین و قەناعەت نەهێنترین وێنەی لێ بدەم بە ئێوە، تاکە واقیعیترین ئەزموونی ژیانم بوو.

لە ڕاستیدا، تاکە کێبڕکێ بۆی لە بواری واقیعدا، ئەوەبوو کە دواتر هات.

بەشی هەشتەم

# ئیسرائیل

بەهاتنی سەعات هەشتی ئەو بەیانییە، هۆڵی هاتبووەوە ژوورەکەم. ئەو جێگۆرکێی لەگەڵ فیلیس کرد، لە شوێنی ئەو لەسەر کورسییەکە دانیشت لە نزیك سەرەوەی پێخەفەکەمەوە و دەستی بێ وزەی منی گوشی. دەوری ١١ی بەیانی، مایکڵ سولیڤان گەیشت و هەمووان بازنەیەکیان لە دەوری من پێکهێنا، بێتسی دەستی منی گرتبوو بۆئەوەی منیش لەناو بازنەکەدا بم. مایکڵ نزایەکی خوێند. ئەوان تازە تەواو دەبوون کاتێك دکتۆرە تایبەتمەندەکانی نەخۆشی پەتا بە راپۆرتێکی تازە لە نهۆمی خوارەوەوە، هاتنە ژوورەوە. وێڕای رێکخستنی ئەنتی بایۆتیکەکەم بەدرێژایی شەو، رێژەی خرۆکەی سپی خوێنم هەر لەزیادبووندا بوو. بەکتریا لە ئەرکی خواردنی مێشکم بێ وچان بەردەوامبوو.

لەکاتێکدا کە بەخێرایی رێگەچارەکانیان دەهاتە برِان، دکتۆرەکان لەگەڵ هۆڵی جارێکی تر بە وردەکاریی چالاکییەکانی چەند رۆژی رابردوومدا چوونەوە. پاشان پرسیارەکانیان چەند هەفتەی رابردووشی گرتەوە. ئایا هیچ شتێك هەبوو– هیچ شتێك– لە وردەکاریی ئەوەدا کە کردوومە و بکرێ یارمەتیدەریان بێت لە دۆخی من تێبگەن؟

هـۆڵی وتــی، "ئـەو چـەند مانگێـك لەمەوبـەر گەشـتێکی کـاری بـۆ ئیـسرائیل ئەنجامدا".

دکتۆر بێنان سەری لە سەر دەفتەی یادداشتەکانی هەڵبڕی.

بەکتریاکانی ئی کۆلای دەتوانن نەك تەنیا لەگەڵ ئی کۆلای-یەکانی تردا بەڵکو لەگەڵ زیندەوەرە بەکتریاکانی تری گرام نێگەتیڤدا ئاڵوگۆڕ بکەن. ئەمەش لەم سەردەمەی گەشتی جیهانیمان، لێزمەی ئەنتی بایۆتیك و جۆرە نوێیە خێرا گۆڕاوەکانی نەخۆشییە بەکترياييەکان دەلالەتی گەورەی هەیە. ئەگەر هەندێ بەکتریای ئی کۆلای خۆیان لە ژینگەیەکی بایۆلۆجی سەختدا لەگەڵ زیندەوەرە بەراییەکانی تر کە باشتر گونجاون ببیننەوە، ئەوا ئی کۆلای حەتمەن دەتوانێ هەندێ DNA لەو بەکتریا باشتر خۆگونجاندووانە هەڵبگرێت و بیگرێتەخۆی.

لە ساڵی ١٩٩٦دا، دکتۆرەکان جۆرێکی نوێی بەکتریایان دۆزییەوە کە DNAی بۆ جینێك بە کۆدی (کلێبسێلا نیومۆنیا کارباپێنێماس KPC) هەڵگرتبوو، ئەنزایمێك کە لەناو بەکتریا خانەخوێکەیدا بەرەنگاری هەبوو لەبەرانبەر ئەنتی بایۆتیکدا. ئەم بەکتریایە لە گەدەی نەخۆشێکدا دۆزرایەوە کە لە نەخۆشخانەی نۆرس کارۆلاینا مرد. جۆرەکە دەستبەجێ سەرنجی دکتۆرەکانی سەرانسەری جیهانی بەلای خۆیدا راکێشا کاتێك دەرکەوت (کلێبسێلا نیومۆنیا) دەتوانێ بە ئەگەرێکی زۆر بەرەنگاری لەو بەکتریایەدا دروست بکات کە هەڵیمژیووە نەك لە بەرانبەر ئەو ئەنتی بایۆتیکانەی ئێستا هەن بەڵکو هەر هەموویان.

ئەگەر جۆرێکی ژەهراویی ئەنتی بایۆتیك کارتێنەکردووی بەکتریا (ئەوەیان کە هاوتا ناژەهراوییەکەی لە گەدەماندا زۆرە) لە ناو گشت خەڵکدا بڵاو بووەوە، ئەوا

شایی و ئاهەنگی دەبێت لەگەڵ رەگەزی مرۆڤدا. هیچ ئەنتی بایۆتیکێکی نوێ نییە لە دە ساڵی گەشەی دەرمانسازیدا کە بتوانێ بە هاناوە بێت.

تەنیا پێش چەند مانگێك، دکتۆر بێرنان دەیزانی نەخۆشێك بە حاڵەتێکی بەکتریایی بەهێزەوە داخڵی نەخۆشخانە کراوە و کۆمەڵێك ئەنتی بایۆتیکی پێدراوە لە هەوڵێکدا بۆ کۆنترۆڵکردنی حاڵەتی (کلێبسێلا نیومۆنیا)یەکەی. بەڵام حاڵەتی کابرا هەرە خراپتر بوو. پشکنینەکان دەریانخست کە هێشتا ئەو بە دەست کلێبسێلا نیومۆنیاوە دەناڵێنێت و ئەنتی بایۆتیکس ئیشی خۆیان نەکردبوو. پشکنینەکانی تر دەریانخست کە ئەو بەکتریایەی کە لە ریخۆڵە ئەستوورەی پیاوەکەدا دەژیت جینی KPCی پەیدا کردووە لە رێگەی گواستنەوەی پلازما لە حاڵەتی کلێبسێلا نیومۆنیاکەیەوە. بە دەربڕینێکی تر، جەستەی، تاقیگەیەکی دابین کردبوو بۆ دروستبوونی توخمێکی بەکتریا کە، ئەگەر بچووایەتە ناو خەڵکەوە، لەوانەبوو تاعونی بنایەتەوە، پەتایەك کە لە سەدەی چواردەهەمدا نیوەی ئەورووپای لەناو برد.

ئەو نەخۆشخانەیەی کە هەموو ئەو شتانەی تیادا روویدا سەنتەری پزیشکیی (سۆراسکی) بوو لە تەلئەبیب، ئیسرائیل و تەنیا پێش چەند مانگێك روویدابوو. لە راستیدا رێك لەو کاتەدا روویدابوو کە من بە ئیشێکی هەماهەنگیکردنی دەستپێشخەرییەکی توێژینەوەی جیهانیی لەبواری نەشتەرگەریی سەرروودەنگی مێشك، چووبوومە ئەوێ. سەعات ٣: ١٥ سەر لەبەیانی گەیشتبوومە ئەوێ و پاش دۆزینەوەی هۆتێلەکەم، بڕیارم دابوو پیاسەیەك بەناو شارە کۆنەکەدا بکەم. دواجار پیاسەیەکی بەر لە سپێدەم بە شەقامی (ڤیا دۆلۆرۆسا)دا کرد و سەردانی ئەو شوێنەم کرد کە ناوی "دوایین ئێوارەخوان"ی عیسای لێنراوە. گەشتەکە

بەشێوەیەکی نامۆ جوڵێنەر بوو و کە گەڕامەوە بۆ ئەمریکا زۆرجار لەگەڵ هۆڵی-دا دەمهێنایە بەر باس. بەڵام ئەو کاتە هیچم لەبارەی نەخۆشەکەی سەنتەری پزیشکیی (سۆراسکی)، یان ئەو بەکتریایەی تووشی ببوو و جینی KPCی هەڵگرتبوو نەزانیبوو. ئەو بەکتریایەی، هێنابوویەکایەوە، خۆی جۆرێکی ئی. کۆلای بوو.

دەشێ من ئەو کاتەی کە لە ئیسرائیل بووم بەشێوەیەك لە شێوەکان بەکتریایەکی دژە ئەنتی بایۆتیکی (KPC) هەڵگرتووم تووش بووبێت؟ ئەگەری نییە. بەڵام ئەمە روونکردنەوەیەکی بەجێ بوو بۆ بەرەنگاریی ئاشکرای نەخۆشییەکەم و دکتۆرەکان چوونە سەر کار بۆ دیاریکردنی ئەوەی ئاخۆ ئەوە بەکتریایە هێرش دەکاتە سەر مێشکم. حاڵەتەکەی من خەریك بوو دەبووە یەکەم هۆکاری گەلێك هۆکاری تر، بەشێك لە مێژووی پزیشکی.

بەشی نۆیەم

# چەقەکە

لەهەمان کاتدا، لە شوێنێکی ناو هەورەکاندا بووم.

شتی سپی پەمەیی باوی قەبە و گەورە لەپڕ لە ئاسمانی تاریکی شین باوی قوولدا .

لە بەرزایی بەرزتری هەورەکانەوە- بەشێوەیەکی پێوانەنەکراو بەرز- پۆلێك گۆی شەفاف دەرکەوتن، بوونەوەری درەوشاوە لەمبەر بۆ ئەوبەری ئاسمان قووت بوونەوە. لەدوای خۆیانەوە شتی وەکو وردەکاغەزی رەنگاورەنگیان لەدوای خۆیان جێ دەهێشت.

باڵندە بوون؟ فریشتە بوون؟ ئەم وشانەك ئەو کاتە تۆمار کرد کە یادەوەرییەکانم دەنووسییەوە. بەڵام هیچ کام لەو وشانە وەسفی ئەو بوونەوەرانە خۆیان ناکات کە بە تەواوی جیاواز بوون لە هەر شتێك کە لەسەر ئەم زەوییە زانیوومە. زۆر گەشەکردووتر بوون. بەرزتر بوون.

دەنگێکی قووڵی قەبە، وەکو هوتافێکی شکۆمەندانە لەسەرەوەڕا هاتە خوار و من بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ لە بوونەوەرە باڵدارەکانەوە بێت. جارێکی تر لە دواییدا

بیرم لێکردەوە، وای بۆچووم کە شادیی ئەم بوونەوەرانە لەکاتێکدا کە بەرز دەبوونەوە هەوا، بە شێوەیەك بێت کە دەبێ ئەم دەنگە دەربکەن- واتە ئەگەر شادی بەم شێوەیە لێیانەوە دەرنەچووایە ئەوا بە پێچەوانەوە نەیاندەتووانی کۆنترۆڵی بکەن. دەنگەکە دەبیسترا و تەقریبەن ماددی بوو، وەکو بارانێك کە دەتووانی لەسەر پێستت هەستی پێبکەیت بەڵام تەڕت ناکات.

بینین و بیستن جودا نەبوون لەم شوێنەی کە ئێستا منی لێ بووم. دەمتووانی جوانیی دیدەنیی جەستە درەوشاوەکانی ئەو بوونەوەرە سەرنجڕاکێشانەی سەرەوە (ببیستم) و دەمتووانی کامڵیی شادیبەخشی زیادبووی ئەوە شتە ببینم کە دەیانخوێند. پێدەچوو لەم جیهانەدا نەتووانیت بڕوانیتە هیچ شتێك و گوێ لە هیچ شتێك بگریت تا نەبیتە بەشێك لێی- تا بەشێوەیەك لە شێوە رازئامێزەکان نەچیتە پاڵی. جارێکی تر، لەم روانگەیەی ئێستامەوە، دەڵێم تۆ نەتدەتووانی بەهیچ شێوەیەك لەو دنیایەدا بڕوانیت (لە) هیچ شتێك چونکە (لە) خۆی دەلالەت لە جیابوونەوەیەك دەکات کە لەوێ بوونی نەبوو. هەموو شتێك جودا بوو، لە هەمان کاتیشدا هەموو شتێك بەشێك بوو لە هەموو شتێکی تر، وەکو دیزاینە دەوڵەمەند و تێکچڕژاوەکانی فەرشی فارسی. . . یان باڵی پەپولە.

بایەکی گەرم هەڵیکرد، وەکو ئەوەیان کە لە رۆژانی کامڵترین هاوینەوە هەڵدەکات، گەڵاکانی درەختەکان ئاوەژوو دەکاتەوە و وەکو ئاوێکی خۆش گوزەر دەکات. شنەبایەکی ئیلاهی. هەموو شتێکی گۆڕی، جیهانی دەورمی گۆڕی بۆ ئاوازێکی بەرزتر، لەرزینەوەیەکی بەرزتر.

هەرچەندە هێشتا زمانم زۆر کەم گۆی دەکرد، لانی کەم بەو شێوەیەی کە لەسەر زەوی بیری لێ دەکەینەوە، بەبێ وشە دەستم کرد بە خستنەبەر پرسیاری ئەم بایە– و ئەو بوونەوەرە ئاسمانییەی کە هەستم کرد لە پشییەوە یان لەناویدام.

ئەم شوێنە کوێیە؟

من کێم؟

بۆچی لێرەم؟

هەر کاتێك کە بە کپی یەکێك لەو پرسیارانەم دەکرد، وەڵامەکە دەستبەجێ لە تەقینەوەیەکی رووناکی، رەنگ، خۆشەویستی و جوانیدا دەهات کە وەکو شەپۆلێکی بڵاوبوو پیامدا رەت دەبوو. ئەوەی کە لەبارەی ئەم شەپۆلە پەرش بووانە گرنگ بوو ئەوە بوو کە هەروا بە سادەیی پرسیارەکانی منیان نەدەوەستاند لە رێگەی زاڵ بوون بەسەریاندا. ئەوان وەڵامیان دەدایەوە، بەڵام بە شێوەیەك کە زمانی تێدەپەڕاند. بیرۆکەکان راستەوخۆ دەهاتنە ناومەوە. بەڵام بەوشێوەیە نەدەچوونە ناو بیرکردنەوە کە ئێمە لە سەر زەوی ئەزموونی دەکەین. لێڵ، نامادی یان ئەبستراکت نەبوون. ئەم بیرۆکانە بەرجەستە و دەستبەجێ بوون– گەرمتر لە ئاگر و تەڕتر لە ئاو بوون– و کە وەرمدەگرتن دەمتووانی دەستبەجێ و بێ هەوڵدان لەو چەمکانە تێبگەم کە لەسەر زەوی ساڵانێکم پێدەچوو تا بە تەواوی دەرکیان پێبکەم.

بەردەوام بووم لە جوڵان بەرەو پێشەوە و بۆم دەرکەوت کە دەچمە ناو بۆشاییەکی گەورەوە، بە تەواوی تاریکە، لە قەبارەدا بێ سنوورە، لەگەڵ ئەوەشدا بێ پایان ئاسودەبەخشە. لەکاتێکدا کە بە تەواوی تاریکی ئەنگوستەچاو بوو، بەهەمان شێوە رووناکی لەسەرەوە دەڕژا: رووناکییەك کە پێدەچوو لە گۆیەکی

درەوشاوەوە بێت کە ئێستا هەستم دەکرد نزیکە لێمەوە. گۆیەك کە زیندوو و تەقریبەن بەرجەستە بوو، وەکو چۆن گۆرانییەکانی بوونەوەرە فریشتەکان وەها بوون.

بارودۆخی من، بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن، شتێك نزیك بوو لە هی کۆرپەلەیەك لەناو منداڵدان. کۆرپەلە بە هاوەڵی پاوەڕ (مشیمە) لە منداڵداندا جێگیر دەبێت خواردنی بۆ دابین دەکات و پەیوەندییەکەی لەگەڵ دایکێکی لە هەموو شوێن ئامادە و لەهەمان کاتدا نادیار، ئاسان دەکات. لەم حاڵەتەدا، "دایك" خودا بوو، خالق بوو، ئەو سەرچاوەیەی کە بەرپرسە لە دروستکردنی گەردوون و هەموو ئەوەی کە لەناویدایە. ئەم بوونەوەرە ئەوەندە نزیك بوو کە پێدەچوو هیچ دوورابییەك نەبێت لەنێوان خودا و خۆمدا. لەهەمان کاتیشدا، دەمتووانی هەستم بە مەزنێتی بێ پایانی خالق بکەم، دەمتووانی بزانم بە بەراورد چەنێك بچوکم. من ناوبەناو (ئۆم) بەکاردێنم وەکو ڕاناوێك بۆ (خودا) چونکە لە بنەڕەتدا پاش کۆماکەم لە نووسینەکانمدا ئەو ناوەم بەکارهێنا. (ئۆم) ئەو دەنگە بوو کە لەیادمە دەمبیست پەیوەست بەو خودا مەزن، بەتوانا و بێ مەرج خۆشویستراوە، بەڵام هەر وشەیەك بۆ وەسفکردنی کورت دەهێنێت.

بۆم دەرکەوت کە هۆکاری ئەوەی گۆیەکە لە تەکمەوەیە ئەو مەزنییە بێگەردەیە کە ئۆم و من لێك جیا دەکاتەوە. بە شێوەیەك لە شێوەکان من نەمدەتووانی بە تەواوی تێبگەم بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیا بووم کە گۆیەکە جۆرێك لە "وەرگێڕ" بوو لەنێوان من و ئەو ئامادەبیە سەرووئاساییەی دەورەی داوم.

وەکو ئەوە وابوو کە لە جیهانێکی گەورەتردا لەدایك بووبم و گەردوون خۆی منداڵدانێکی زەبەلاحە و گۆیەکە (کە بە جۆرێك لە جۆرەکان بەشێوەی رایەڵ بە

کچەکەی سەر باڵی پەپولەکە مایەوە، لە ڕاستیدا هەر ئەویش بوو) بەم پرۆسەیەدا ڕێنمایی دەکردم.

دواتر، کاتێك گەڕامەوە سەر ئەم زەوییە، وتەیەکی شاعیری مەسیحیی سەدەی حەڤدەهەم(هێنری ڤۆگان)م بینی کە نزیك بوو لە وەسفکردنی ئەم شوێنەوە– ئەم چەقە مەزنە ڕەشە مەرەکەب ئاسایە کە ماڵی خودی خوداوەند بوو.

"هەندێ دەڵێن، تاریکاییەکی قووڵ بەڵام چاو لەبەرهەڵنەهاتوو لە خوا دا هەیە. . ."

ڕێك وەها بوو: تاریکاییەکی مەرەکەب ئاسا کە بەهەمان شێوە ڕووناکی لێوە دەدرەوشایەوە. پرسیارەکان و وەڵامەکانیش درێژەیان هەبوو. هەرچەندە هێشتا لە شێوەی زماندا نەبوون بەو شێوەیەی کە دەیزانین، دەنگی بوونەوەرەکە گەرم و گوڕ و – هەرچەندە ئەوەی کە دەیڵێم لەوانەیە سەیر بێت– کەسی بوو. لە مرۆڤ تێدەگەیشت و ئەو تایبەتمەندییانەی هەبوو کە ئێمەومانان هەمانە، تەنیا قەبارەیەکی گەورەتری هەبوو. منی دەناسی و بە قووڵی سەرڕێژ بوو لەو تایبەتمەندییانەی کە هەموو ژیانم پەیوەستم دەکردنەوە بە مرۆڤ، و تەنیا و تەنیا مرۆڤەکان: گەرم و گوڕی، بەزەیی. . . تەنانەت گاڵتە و سوعبەتیش.

لە ڕێگەی گۆیەکەوە، ئۆم پێی وتم نەك تەنیا گەردوونێك بەڵکو چەندەها گەردوون هەن– لە ڕاستیدا، زۆرتر لەوەی کە بتوانم پەی پێ ببەم– بەڵام ئەو خۆشەویستییە لە چەقی هەموویاندا هەیە. ئەهریمەنیش لە هەموویاندا ئامادەیی هەیە، بەڵام تەنیا بە بچوکترین شوێنەوار. ئەهریمەن پێویستە چونکە بەبێ ئەو ئیرادەی سەربەست مەحاڵە و بەبێ ئیرادەی سەربەست گەشەکردن لەئارادا نەبێت– هیچ جوڵەیەك بەرەو پێشەوە نابێت، هەلی ئەوە نابێ ببینە ئەو شتەی کە خودا

لیمانی چاوەڕێ دەکات. وەکو چۆن هەندێ جار لە جیهانێکی وەکو ئەوەی ئێمەدا ئەهریمەن تۆقێنەر و بەهێز دیار بوو، لە وێنە فراوانەکەدا خۆشەویستی تەواو زاڵ بوو و دواجار سەردەکەوت.

من فرەیی ژیانم لە سەرانسەری گەردوونە بێ شومارەکاندا بینی، لەوانەش زیرەکییان لەسەروو مرۆڤایەتییەوە بوو. بینیم کە لەوێ بەشێوەیەکی بێ شومار ڕەهەندێ باڵا هەن، بەڵام تاکە ڕێگە بۆ زانینی ئەم ڕەهەندانە ڕاستەوخۆ داخڵبوون و ئەزموونکردنە لەناویاندا. ناتوانرێ لە بۆشاییەکی ڕەهەندیی نزمەوە بزانرێن، یان دەرك بکرێن. هۆکار و دەرەنجام لەو ئاستە بەرزانەدا هەبوون، بەڵام لە دەرەوەی ئەو تێگەیشتنەی ئێمە لەسەر زەوی هەمانە. جیهانی ئەو کات و بۆشاییەی کە ئێمە تیایدا دەجوڵێین لەم پانتاییەی زەویدا بەشێوەیەکی تۆکمە و ئاڵۆزکاو لەناو ئەم جیهانە بەرزترانەدا گونجێنراوە. بە دەربڕینێکی تر، ئەم جیهانانە بە تەواوی لەوەی ئێمە جودا نین، چونکە هەموو جیهانەکان بەشێکن لە هەمان واقیعی سەراپاگیریی یەزدانی. ئەتوانیت لەو جیهانە بەرزترانەوە هەرکاتێك و هەر شوێنێك بتەوێ خۆتی پێ بگەیەنیت.

تەواوی پاشماوەی ژیانم پێ دەچێت تا هەموو ئەو شتە هەڵڕێژم کە لە وێ فێری بووم. ئەو زانینەی بە من دەدرا "فێرکردن" نەبوو وەکو وانەیەکی تیۆرەی مێژوو یان ماتماتیك. تێگەیشتنەکان بەشێوەیەکی خۆبەخۆ ڕوویاندەدا، نەك ئەوەی پێویست بکات هەڵوەستەیان لەسەر بکرێت و وەربگیردرێن. زانین بەبێ لەبەرکردن خەزن دەبوو، دەستبەجێ و بۆ هەمیشە. وەکو زانیاریی ئاسایی بیر نەدەچووەوە و تاوەکو ئەمڕۆش هەموویم لایە، ڕوونتر لەو زانیارییەی کە بە درێژایی ساڵانی قوتابخانە بەدەستم هێنا.

ئەمە بەو مانایەش نییە کە دەتووانم هەروا بەو سادەییە بگەمە ئەو زانیارییە. لەبەرئەوەی ئێستا کە گەڕاومەتەوە سەر پانتایی زەوی، دەبێت لە چوارچێوەی سنووورداری و مێشك و جەستەی فیزیکیمدا سۆراخی بکەم. بەڵام هەر هەیە. هەستی پێدەکەم، لەناو بوونمدا رەگی داکوتاوە. بۆ کەسێکی وەکو من کە تەواوی ژیانی بە ئیشی سەرسەختانەی کەڵەکەکردنی زانین و تێگەیشتن بە شێوازی تەقلیدیی بەسەر بردووە، کەشفکردنی ئەو ئاستە پێشکەوتووترەی فێربوون، بە تەنیا، بەش بوو بۆ ئەوەی بیرکردنەوەم بۆ چەندەها سەردەمی ئایندەش تێر بکات.

بەداخەوە، بۆ خێزانەکەم و دکتۆرەکانی سەر زەوی، بارودۆخەکە زۆر جیاواز بوو.

بەشی دەیەم

# ئەوەی کە گرنگە

هۆڵی تووانی ئەوە بەدی بکات کە دکتۆرەکان چەندە بایەخدەر بوون کاتێك باسی سەفەرەکەمی کرد بۆ ئیسرائیل. بەڵام تێنەگەیشت کە بۆچی ئەوەندە گرنگە. لە بەرانبەردا، نیعمەت بوو کە تێنەگەیشت. خۆگونجاندن لەگەڵ ئەگەری مردنی مندا، بەبێ ئەگەری زیادەی ئەوەی کە دەچمە ناو لیستی کەیسەکانی سەدەی بیست و یەك بۆ نەخۆشییەکی هاوشێوەی تاعون.

لەهەمان کاتدا، پەیوەندیی تەلەفۆنی زیاتر کرا بۆ هاوڕێکان و خانەوادەکەم.

کاتێك کوڕێکی منداڵ بووم، باوکم دەپەرست، کە ماوەی بیست ساڵ سەرۆکی ستاف بوو لە سەنتەری پزیشکیی تەعمیدیی (وەیك فۆرێست) لە (وینستن سالەم). من نەشتەرگەریی ئەکادیمیی مێشکم وەکو پیشەیەك هەڵبژارد بۆئەوەی ئەوەندەی بکرێ شوێن پێی ئەو هەڵگرم– وێڕای زانینی ئەوەی کە من قەت بە تەواوی ئەمەم پێنەکرا.

باوکم هەتا بڵێی پیاوێکی دیندار بوو. ئەو لە ماوەی دووەم جەنگی جیهانیدا وەکو نەشتەرگەر لە هێزی ئاسمانیی سوپا لە دارستەکانی (کینیای نوێ) و

(فلیپین) خزمەتی کردبوو. ئەو دڵڕەقی و ئێش و ئازاری بینیبوو و خۆشی ئازاری چەشتبوو. ئەو باسی ئەو شەوانەی بۆ کردم کە بە ئیشکردن لەسەر زیانە جەستەییەکانی جەنگ بەسەری بردبوو لەو خێمانەدا کە بە بەتانی راگیرابوون و شەستەباران لێیدەدان، گەرما و شێ ئەوەندە توند بوون کە نەشتەرگەرەکان جلی ژێرەوەیان لەبەر خۆیاندا دەهێشتەوە تا بەرگەی بگرن.

باوکم لە ساڵی ١٩٤٢دا هاوسەرگیری لەگەڵ (بێتی)ی خۆشەویستی ژیانی (و کچی ئەفسەرە فەرماندەکەی) دا کردبوو، لەکاتێکدا خەریکی مەشق بوو بۆ خزمەتەکەی لە یەکێك لە گۆڕەپانەکانی جەنگ. لە کۆتایی جەنگدا، ئەو بەشێك بوو لە گروپی سەرەتایی هێزە هاوپەیمانەکان کە ژاپۆنیان داگیرکردبوو پاش ئەوەی ئەمریکا بۆمبی ئەتۆمی بەسەر هیرۆشیما و ناگازاکی–دا بەردابووەوە. وەکو تاکە نەشتەرگەرێکی مێشکی سوپای ئەمریکا لە تۆکیۆ، ئەو بە ڕەسمی پێویست بوو. ئەو رێگەپێدراو بوو نەشتەرگەریی گوێ، لووت و قورگ ئەنجام بدات.

هەموو ئەو پسپۆڕییانە ئەوەی مسۆگەر کرد کە بەو زووانە ناچێتە هیچ شوێنێکی تر. ئەفسەرە فەرماندەیە نوێکەی رێگەی پێنەدەدا بگەڕێتەوە ئەمریکا تا ئەوەی کە بارودۆخەکە "جێگیرتر" دەبوو. چەند مانگێك پاش ئەوەی ژاپۆنییەکان لەسەر کەشتیی جەنگیی (میسۆری) لە کەناراوی تۆکیۆ بە رەسمی خۆیاندا بەدەستەوە، دواجار باوکم فرمانی گشتی پێگەیشت کە رێگەی دەدا بگەڕێتەوە وڵات. لەگەڵ ئەوەشدا، دەیزانی کە ئەگەر ئەفسەری فەرماندەی شوێنەکە ئەو فرمانانەی ببینیایە ئەوا هەڵیدەوەشاندنەوە. بۆیە باوکم تا کۆتایی هەفتە چاوەڕێ بوو، کاتێك ئەو ئەفسەرە چووە دەرەوەی بنکە بۆ پشوو و لە رێگەی ئەفسەری فەرماندەی جێگرەوە فەرمانەکانی سۆراخ کرد. ئەو دواجار توانی سواری کەشتییەك بێت کە

لە کانوونی یەکەمدا دەگەڕایەوە نیشتمان ماوەیەکی زۆر دوای ئەوەی کە هاوەڵە سەربازەکانی گەڕابوونەوە ناو خێزانەکانیان.

پاش گەڕانەوە بۆ ئەمریکا لە سەرەتاکانی ١٩٤٦دا، باوکم ڕۆیشت ڕاهێنانی نەشتەرگەری تەواو بکات لەگەڵ هاوڕێ و هاوپۆلی سکوڵی پزیشکی هارڤارد، (دۆناڵد ماتسن) کە لە گۆڕەپانی جەنگی ئەورووپا خزمەتی کردبوو. ئەوان لە (پیتەر بێنت بریگام) و نەخۆشخانەکانی منالان (نەخۆشخانە سەرەکییەکانی سکوڵی پزیشکیی هارڤارد) لە بۆستن بە سەرپەرشتی دکتۆر (فرانك. دی ئینگراهام) ڕاهێنانیان کرد کە دوایین مەشقکار بوو کە لەلایەن دکتۆر (هارڤی کوشین) ڕاهێنانی پێکرا، کە لەسەر ئاستی جیهان بە باوکی نەشتەرگەریی مۆدێرنی مێشك دادەنرێت. لە پەنجاکان و شەستەکاندا، تەواوی کادیرانی نەشتەرگەریی مێشکی "٣١٣١C" (کە بەشێوەیەکی ڕەسمی لەلایەن هێزی ئاسمانیی سوپاوە پۆلێنبەندی کرابوون)، کە پیشەی خۆیان لە شەڕگەکانی ئەورووپا و ئۆقیانووسی ئارام پەرەپێدابوو، بوون بە نموونە بۆ نیو سەدەی دواتری نەشتەرگەرانی مێشك، لەوانەش جیلەکەی من.

دایك و باوکم لەماوەی (بێبازاڕیی گەورە)دا گەورە بوون و بەستراببوونەوە بە ئیشەوە. باوکم تەقریبەن هەمیشە بۆ نانی ئێوارە لە سەعات ٧ ئێوارەوە لە ماڵەوە بوو، بەزۆری بە قات و بۆینباخەوە، بەڵام ناوبەناو جلی نەشتەرگەری لەبەردابوو. پاشان دەگەڕایەوە بۆ نەخۆشخانە و یەکێك لە ئێمەی منالی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆئەوەی لە ئۆفیسەکەیدا سەعی بکەین لەکاتێکدا کە نەخۆشەکانی بەسەر دەکردەوە. بەلای باوکمەوە، ژیان و ئیش لە جەوهەردا هاوواتا بوون و بەو پێیەش ئێمەی پێگەیاند. ئەو زۆرجار من و خوشکەکانی ناچار دەکرد لە ڕۆژانی یەکشەممەدا ئیشی حەوشە بکەین. ئەگەر پێمان بوتایە دەمانەوێ بچینە سینەما،

ئەوا لە وەڵامدا دەیوت: "ئەگەر تۆ بچیتە سینەما ئەوا دەبێ کەسێکی تر ئیش بکات". ئەو بەهەمان شێوە پێشبڕکێکار بوو. لە یاری (سکواش)دا، هەموو یارییەکی بە "شەڕ تا مردن" لەقەڵەم دەدا و تەنانەت لە هەشتاکانی تەمەنیشیدا هەمیشە بەدوای رکابەری تازەدا دەگەڕا، زۆرجار چەند دەیەیەك گەنجتریش.

ئەو باوکێکی فشارهێن بوو، بەڵام بێ وێنەش بوو. ئەو هەر کەسێك کە پێی دەگەیشت بەڕێزەوە چارەسەری بۆ دەکرد و دەرنەفیزێکی لە گیرفانی چاکەتی تاقیگەکەیدا هەڵدەگرت بۆئەوەی لەکاتی بەسەرکردنەوەی نەخۆشەکانیدا برغوی شل لە هەر شوێنێك توند بکاتەوە کە بەرچاوی بکەوێت. نەخۆشەکانی، هاوەڵە پزیشکەکانی، پەرستارەکان و تەواوی ستاف نەخۆشخانە خۆشیان دەویست. چ لە ئیشکردن لەسەر نەخۆشەکان بووایە، یان یارمەتیدان لە توێژنەوەی پێشکەوتوودا، مەشقکردن بە نەشتەرگەرانی مێشك (تاکە هیوایەت)، یان نووسەری لە بڵاوکراوەی دەمارناسی نەشتەرگەری (کە چەند ساڵێك ئیشی تیا کرد) ، باوکم ئەوەی بەدیکرد کە ڕێچکەی ژیانی دیاریکراوە. تەنانەت ئەو کاتەش کە لە تەمەنی حەفتاویەك ساڵیدا دواجار لە ژووری نەشتەرگەری هاتە دەرەوە، بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن لەگەڵ دوایین بەرەوپێشچوونەکان لە بوارەکەدا. پاش مردنی لە ساڵی ٢٠٠٤دا، هاوکارە لەمێژینەکەی، (دکتۆر ئێڵ. کێلی جونیەر) نووسیبووی "دکتۆر ئەلێکزاندەر هەمیشە بە تامەزرۆییەکەی و شارەزایەتییەکەی، خۆگرییەکەی و وردەکارییەکەی، رۆحی هاوسۆزییەکەی، راستگۆییەکەی و لێهاتووییەکەی لەهەموو ئەو شتانەدا کە کردنی، لە یاد دا دەمێنێتەوە". سەیر نەبوو کە من، وەکو زۆرێك لەوانیتر، دەمپەرست.

زۆر بە زوویی، ئەوەندە لەمێژە کە نازانم کەی بوو، باوك و دایکم پێیان وتبووم کە من بەخێوکراوم (یان "هەڵبژێردراوم" وەکو خۆیان دەیانگوت، چونکە دڵنیایان کردبوومەوە کە هەر لەو ساتەوەی بینیبوویانم زانیبوویان منالّی ئەوانم). ئەوان دایك و باوکی بایۆلۆجی من نەبوون، بەڵام زۆر خۆشیان دەویستم وەك بڵێی لە خوێن و گۆشتی ئەوانم. من هەر لە گەورەبووندابووم کاتێك لە نیسانی ١٩٥٤دا زانیم لە تەمەنی چواردە مانگییەوە بەخێوکراوم و ئەمەی کە دایکی راستەقینەم شانزە ساڵان بووە– ساڵی دووەمی بووە لە ئامادەیی– کاتێك لە ١٩٥٣دا منی هێناوەتە دنیاوە هاوسەری نەبووە. کورە هاورێکەی، کە دوایین ساڵی بووە لە ئامادەیی و ئامادەیی ئەوەی تیا نەبووە منالێك بگرێتەخۆ، رازی بووە لەسەر دەستبەردار بوونم، هەرچەندە هیچ کامیان ئەوەی نەویستووە. ئەم زانیارییە ئەوەندە بەزووی بەگوێمدا درا کە هەروا بە سادەیی بوو بە شێك لەوەی کە کێم، قبوڵکراو و حاشاهەڵنەگر وەکو رەشیی قژم و ئەو راستییەی کە حەزم لە هەمبەرگر و رقم لە قەرنابیتە. باوك و دایکە بەخێوکەرەکەم ئەوەندە خۆش دەویست کە ئەگەر لە خوێنی ئەوانیش بوومایە هەر ئەوەندە خۆشم دەویستن، ئەوانیش هەمان هەستیان بەرانبەرم هەبوو.

خوشکە گەورەکەشم، (جین)، بەخێو کرابوو، بەڵام پێنج مانگ پاش ئەوەی منیان گرتەخۆ، دایکم توانیبووی خۆی منالێك بهێنێتە دنیاوە. ئەو منالێکی کچی بوو –بێتسی خوشکم– و پێنج ساڵ دواتر، فیلیس کە لە هەمووان منالّتر بوو، هاتەدنیاوە. ئێمە لە هەموو نیاز و مەبەستەکاندا خوشك و برای تەواوەتی بووین. دەمزانی کە لە هەر کوێیەکەوە هاتبم، برای ئەوانم و ئەوانیش خوشکمن. من لە خانەوادەیەکدا گەورە بووکم کە نەك تەنیا خۆشیان ویستم بەڵکو تەنانەت باوەڕیان

پێهێنام و پشتگیریی خەونەکانیان کردم. لەوانەش ئەو خەونەی کە لە ئامادەیی داگیری کردم و قەت نەرۆیشت تا بەدەستم هێنا: بوون بە نەشتەرگەری مێشك، وەکو باوکم.

لە سالانی کۆلێژ و سکوڵی پزیشکیدا بیرم لەوە نەدەکردەوە کە بەخێوکراوم- لانی کەم لە رووکەشدا. من چەند جارێك چوومەتە خانەی بێ دایك و باوکانی (نۆرس کارۆلاینا) بۆ زانینی ئەوەی کە ئاخۆ دایکم هیچ بایەخ دەدات بەوەی یەکتر ببینینەوە. بەڵام نۆرس کارۆلاینا هەندێ لە توندترین یاسای وڵاتی پیادە دەکرد بۆ پارێزگاری لە منالی بەخێوکراو و دایك و باوکانی راستەقینەی، تەنانەت ئەگەر بەشێوەیەکی نائومێدانەش بیانویستایە یەکتر بگرنەوە.

پاش درەنگانی تەمەنی بیستەکانم، کەمتر و کەمتر بیرم لە مەسەلەکە کردەوە. ئەو کاتەش کە چاوم بە هۆڵی کەوت و خێزانی خۆمان پێکهێنا، پرسەکە زیاتر بەرەو نەمان چوو.

لە ساڵی ١٩٩٩دا، کاتێك ئەو دوانزە ساڵان بوو و ئێمە هێشتا لە (ماساشوسێتس) دەژیاین، ئێبێنی چوارەم پرژایە سەر پرۆژەیەکی کەلەپووری خێزانی لە سکوڵی (چارلز ریڤەر) کە ئەو کاتە پۆلی شەش بوو. ئەو دەیزانی من بەخێوکراوم و ئەو کەس و کاری راستەوخۆی هەیە کە بەشێوەی کەسی، تەنانەت بە ناویش، نایانناسێت. پرۆژەکە شتێکی لەودا هێنایەکایەوە- پرسیارێکی قووڵ، کە تا ئەو ساتە، نەیزانیووە کە هەیەتی.

پرسیاری لێکردم ئاخۆ دەتوانین سۆراخی دایك و باوکی راستەقینەم بکەم. پێم وت کە خۆم بە درێژایی ساڵانێك ناوبەناو بیرم لە مەسەلەکە کردووەتەوە،

پەیوەندیم کردووە بە خانەی بێ باوك و دایکانی نۆرس کارۆلاینا و پرسیوومە ئاخۆ هەواڵیان هەیە.

ئەمە سەغڵەتی نەکردم. بە ئێبێنم وت، "لە بارودۆخی وەهادا بە تەواوی سروشتییە. ئەمە بەو مانایە نییە کە دایکی راستەقینەم خۆشی ناوێم یان تۆی خۆش نەدەویست گەر چاوی پێت بکەوتایە. بەڵام نایەوێ، زیاتر لەبەرئەوەش کە هەمان هەستی تۆی هەیە و من خێزانی خۆمانم هەیە و ئەو نایەوێ تەگەرە دروست بکات".

ئێبێن هەروا وازی نەدەهێنا، بۆیە دواجار بیرم لەوە کردەوە کە ئاواتەکەی بێنمەدی و نامەیەکم بۆ کارمەندێکی کۆمەڵایەتی بە ناوی (بێتی) نووسی لە خانەی بێ دایك و باوکان کە پێشتر لە چەند داواکارییەکەمدا یارمەتی دابووم. چەند هەفتەیەك دواتر، لە پاش نیوەڕۆی هەینییەکی بەفراویی ساڵی ٢٠٠٠دا، من و ئێبێنی چوارەم لە بۆستنەوە دەچووینە (مەین) بۆ بەسەربردنی پشوویەکی خلیسکێنەی سەر بەفر کاتێك بیرم کەوتەوە کە کاتی ئەوە هاتووە تەلەفۆنێك بۆ بێتی بکەم بۆ زانینی دەنگ و باسی تازە. بە مۆبایلەکەم تەلەفۆنم بۆی کرد و وەڵامی دایەوە.

وتی "لە راستیدا هەندێ هەواڵم لایە. دانیشتوویت؟ "

لە راستیدا من دانیشتبووم، بۆیە وام وت، ئەوەم نەوت کە بەناو کرێوەیەکدا ئۆتۆمبێل لێدەخورم. وتی "دکتۆر ئەلیگزاندەر، وادیارە دایك و باوکە راستەقینەکەت بە راستی هاوسەرگیرییان کردووە"

تووشی دڵەکوتێ بووم و رێگای بەردەمم بوو بە خەیاڵی و درێژ بووەوە. هەرچەندە دەمزانی کە دایك و باوکم خۆشەویستی یەکتری بوون، هەمیشە پێم وابوو هەر کە دەستیان لە من بەردا، ژیانی هەریەکەیان ئاراستەی جودای وەرگرتووە.

دەستبەجێ وێنەیەك هاتە خەیاڵمەوە. وێنەی دایك و باوکی راستەقینەم و ماڵێك کە لە شوێنێك بونیادیان ناوە. ماڵێك کە قەت نەمزانیووە. ماڵێك کە– من بەشێك نیم لێی.

بێتی خەیاڵی پچڕاندم و وتی "دکتۆر ئەلێگزاندەر؟ "

بە هێواشی وتم "بەڵێ، گوێم لێتە"

"شتی تریش هەیە پێتی بڵێم"

ئێبێن سەری سوڕما، ئۆتۆمبێلەکەم لە لایەکی شەقامەکەوە راگرت و بە بێتی–م وت بەردەوام بێت.

"دایك و باوکت سێ منالّی تریان هەیە: دوو خوشك و برایەك. من پەیوەندیم بە خوشکە گەورەکەتەوە کردبوو و پێی وتم خوشکە بچوکەکەت دووساڵ لەمەوبەر مردووە. دایك و باوکت هێشتا خەفەتی بۆ دەخۆن".

پاش وەستانێکی زۆر پرسیارم کرد "کەواتە مانای ئەوەیە کە. . . ؟ " هێشتا گێژ بووم، هەموویم هەر گوێ لێ دەگرت بەبێ ئەوەی لە هیچی شی بکەمەوە.

"بەداخەوەم دکتۆر ئەلێگزاندەر، بەڵام بەڵێ– بەو مانایەیە کە داوای تۆ بۆ پەیوەندیکردن رەت دەکاتەوە".

ئێبێن لە شوێنی خۆیەوە لە پشت من سوڕا، بە روونی ئاگادار بوو کە تازە شتێکی گرنگ روویداوە بەڵام سەری سوڕمابوو لەوەی کە دەبێ چی بێت.

پاش ئەوەی تەلەفۆنەکەم داخستەوە پرسیاری کرد "چیە باوکە؟ "

وتم "هیچ. ئاژانسەکە هێشتا زۆر نازانێ، بەڵام ئیشی لەسەر دەکەن. لەوانەیە کاتێکی تر. لەوانەیە. . . "

بەڵام دەنگم بەرەو وەستان چوو. لە دەرەوە، زریانەکە بە راستی دار و بەردی هەڵدەگرت. تەنیا دەمتووانی سەد یارد*ێك لە پێشمەوە ئەو دارستانە سپییە نزمە ببینم کە لە دەورمان بوو. گێڕی ئۆتۆمبێلەکەم گۆڕی، بە وردی روانیمە ناو ئاوێنەکەی بەردەمم و کشامەوە بۆ ناو جادەکە.

لەپڕ، بینینم بۆ خۆم بە تەواوی گۆڕابوو. بێگومان پاش تەلەفۆنەکە هێشتا هەموو ئەو شتانە بووم کە پێشتر بووم: هێشتا زانایەك بووم، دکتۆرێك بوو، باوك بووم و مێرد بووم. بەڵام بەهەمان شێوە، بۆ یەکەمین جار، هەستم کرد هەتیوم. کەسێك کە بەلاوەنراوە. کەسێك کە کەمتر لە ١٠٠٪ دەویسترێت.

پێش ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنییە، بە راستی بەو شێوەیە بیرم لە خۆم نەکردبووەوە– وەکو کەسێك کە لەسەرچاوەکەی دابڕاوە. قەت وەها پێناسەی خۆمم نەکردبوو کە شتێکم لەدەستداوە و دەشێ قەت بەدەستی نەهێنمەوە. بەڵام لەپڕ تاکە شتێك بوو لەبارەی خۆمەوە کە دەمتووانی ببینم.

لە ماوەی چەند مانگی دواتردا ئۆقیانوسێك لە خەمباری لەناومدا کرایەوە: خەمێکی کە هەڕەشەی راماڵین و نغرۆکردنی هەموو ئەو شتانەی ناو ژیانمی دەکرد کە بەو پەڕی هەوڵ و تەقەلاوە بونیادم نابوو.

ئەمە بە لاوازیم بۆ گەیشتن بەوەی ببووە هۆکار بۆ ئەو دۆخە، خراپ و خراپتر بوو. پێشتر کەوتبوومە ناو کێشەکانی ناو خۆمەوە– بۆ تێڕوانینی من کەموکوڕی– و راستم کردبوونەوە. لە سکوڵی پزیشکی و لە رۆژانی سەرەتادا وەکو نەشتەرگەر، بۆ نموونە، بەشێك بووم لە کەلتوورێك کە تیایدا مەشروب خواردنەوەی زۆر، لە بارودۆخی گونجاودا، پەسەند بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٩١دا پەیتا پەیتا تێبینی ئەوەم

---

یاردێك سێ پێیە

کرد کە بە کەمێك تامەزرۆیی زیاترەوە چاوەڕێی ڕۆژی پشوو و ئەو مەشروبانە دەکەم کە لەگەڵیدابوون. بڕیارمدا کە کاتی ئەوە هاتووە خواردنەوەی کحول بە تەواوی تەرك بکەم. ئەمەش بە هیچ شێوەیەك ئاسان نەبوو—زیاتر لەوەی کە هەستم پێکردبوو پشتم بەو بەو خۆبەتاڵکردنەوەیە بەستبوو کە ئەو سەعاتانەی پشوو دابینیان دەکرد— و تەنیا بە پشتگیریی خانەوادەکەم لەو ڕۆژە سەرەتاییانەی هۆشیاریدا سەرکەوتوو بووم. کەواتە ئەوەش کێشەیەکی تر، ئاشکراشە کە تەنیا من مایەی سەرکۆنەم. یارمەتیم لەبەردەمدا بوو ئەگەر بمویستایە داوای بکەم. بۆچی نەمدەتووانی بنەبڕی بکەم؟ هەر ڕاست نەبوو کە بڕە زانیارییەکی پەیوەست بە ڕابردووم— بڕێك کە لە دەست مندا نەبوو— بتووانێ بە تەواوی لەڕووی سۆزی و پیشەییەوە بەلاڕێمدا ببات.

بۆیە کەوتمە ململانێ و بە نابڕواییەوە ڕوانیم چونکە ڕۆڵەکانی من وەکو دکتۆر، باوك و مێرد پیادەکردنیان قورستر ببوو. بە بینینی ئەمەی کە من باشترین خودی خۆم نەبووم، هۆڵی کاتێکی چوون بۆ ڕاوێژی هاوسەرێتی ڕێکخست. هەرچەندە ئەو تەنیا بەشێوەیەکی ڕێژەیی زانی هۆکارەکە چییە، ئەو منی بەخشی لەبەرانبەر کەوتنە ناو ئەو چاڵەی نائومێدی و ئەوپەڕی هەوڵی خۆیدا تا دەرمبهێنێتەوە. خەمۆکییەکەم لە کارەکەمدا ڕەنگدانەوەی هەبوو. بێگومان دایك و باوکم لەو گۆڕانەم ئاگادار بوون و هەرچەندە دەمزانی ئەوانیش بەخشندەن، خەفەتی دامێ کە پیشەکەم لە ئەکادیمیای نەشتەرگەریی مێشکدا بەرەو داتەپین دەچوو — و هەموو ئەو شتەی کە ئەوان دەیانتووانی بیکەن، تەماشاکردن بوو لە کەنارەکانەوە. بەبێ بەشداری من، خانەوادەکەم دەستەوستان بوو لە یارمەتیدانم.

دواجاریش، کاتێك ئەم خەمە نوێیە دەرکەوت و نەما، لە شتێکی تر ڕامام: دوایین ئومێدی نیوەدانپیانراوم بەوەی کە ڕەگەزێکی کەسی هەیە لە گەردووندا– هێزێکی سەروو ئەو هێزە زانستییانەی کە ساڵانێکم لە تاووتوێکردنیاندا بەسەر بردووە. بە دەربڕینێکی کەمتر پزیشکی، دوایین باوەڕی ڕامالّیم بەوەی کە دەشێ جۆرە بوونەوەرێك هەبێ کە بە ڕاستی خۆشی بوێم و گرنگیم پێبدا– و ئەمەی کە نزاکانم لەوانەیە ببیسترێن و تەنانەت وەڵام بدرێنەوە. پاش ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنییە لە کاتی کرێوەکەدا، بیرۆکەی خودایەکی کەسیی بەسۆز– ماق سکماکیم، تا ئاستێك لە ئاستەکان، وەکو ئەندامێکی هاتوچۆکەری کلێسا لە کەلتوورێکدا کە ئەو خودایەی بە جددی گرتووە– بە تەواوی ون بوو.

ئایا هێزێك یان سەرچاوەیەکی زیرەك هەبوو چاودێری هەر هەموومان بکات؟ کێ بە شێوازێکی بەسۆزانەی ڕاست گرنگی بە مرۆڤەکان دەدا؟ شتێکی لەناکاو بوو کە دواجار قەناعەت بێنیت کە سەرباری هەموو ڕاهێنان و ئەزموونی پزیشکیم، بە ئاشکرا هێشتا بە تامەزرۆییەوە، ئەگەرچی بە نهێنیش، بایەخم بەو پرسیارە دەدا، وەکو چۆن یەکجار زۆرتر لەوەی هەستم پێکردبوو بایەخم بەمەسەلەی دایك و باوکی ڕاستەقینەم دەدا.

بەداخەوە، وەڵامی ئەو پرسیارەی ئاخۆ جارێکی تر دایك و باوکی ڕاستەقینەم ژیان و دڵیان بۆ من دەکەنەوە.

وەڵامەکە نەخێر بوو.

بەشی یانزەهەم

## کۆتاییهاتنی خراپبوون بە ئاراستەی خوارەوە

بۆ ماوەی حەوت ساڵی دواتر، ژیانی پیشەییم و ژیانی خانەوادەکەم بەرەو خراپی چوو. بۆ ماوەیەکی درێژ خەڵکی دەوروبەرم- تەنانەت ئەوانەی زۆر لێمەوە نزیک بوون- دڵنیا نەبوون کە چی هۆکاری کێشەکەیە. بەڵام پەیتا پەیتا- لە ڕێگەی ئەو تێبینییانەی کە تەقریبەن بە ڕێکەوت دەمخستنەڕوو- هۆڵی و خوشکەکانم زانیان چ دەگوزەرێ.

دواجار، لە بەرەبەیانێکدا لە کەناراوی (ساوز کارۆلاینا) لەماوەی بەسەربردنی پشوویەکی خێزانی لە تەمووزی ٢٠٠٧دا، بێتسی و فیلیس بابەتەکەیان هێنایە بەر باس. فیلیس پرسیاری کرد "بیرت لەوە کردووەتەوە نامەیەکی تر بۆ دایك و باوکی راستەقینەت بنووسی؟ "

بێتسی وتی "بەڵێ. لەوانەیە شتەکان تاوەکو ئێستا گۆڕانیان بەسەردا بهاتایە، تۆ چوزانیت". بێتسی هەر بەم دواییە پێمانی وتبوو کە بیر لەوە دەکاتەوە خۆی منداڵێك بگرێتەخۆ، بۆیە من بە تەواوی سەرم نەسوڕما کە بابەتەکە هاتە بەر باس. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، وەڵامی لەناکاوم- لە هۆشی خۆمدا نەك بە دەم- بەم

شێوەیە بوو: ئۆه نا، جارێکی تر نا! ئەو درزە گەورەیەم بیرهاتەوە کە لەژێرمەوە دروست بوو کاتێك پێش حەوت ساڵ ڕووبەڕووی ڕەفزێك بوومەوە. بەڵام دەمزانی دڵی بێتسی و فیلیس لەسەر حەقن. دەیانزانی ئازار دەچێژم، دواجار زانییان بۆچی و –بەشێوەیەکی ڕاست و دروست– لە پێناو مندا ویستیان هەنگاو بنێم و هەوڵ بدەم کێشەکە چارەسەر بکەم. ئەوان دڵنیایان کردمەوە کە شانبەشانی من لەو ڕێگەدا هەنگاو دەنێن– و ئەمەی کە لەم هەوڵەمدا وەکو پێشوو تەنیا نابم. ئێمە تیمێك بووین. بۆیە لە سەرەتاکانی مانگی ئابدا، نامەیەکم بۆ خوشکی ڕاستەقینەم نووسینی کە ئاگاداری بابەتەکە بوو و ناردەم بۆ بێتی لە خانەی بێ دایك و باوکانی نۆرس کارۆلاینا:

"خوشکی ئازیزم،

من بایەخ بە پەیوەندیکردن لەگەڵ تۆ، براکەمان و دایك و باوکمان دەدەم. پاش گفتوگۆیەکی درێژ لەگەڵ دایك و خوشکانی زڕم لەسەر ئەم بابەتە، پشتگیریی و گرنگی پێدانیان، ویستی منیان زیندوو کردەوە بۆ زانینی زیاتر لە بارەی خانەوادەی ڕاستەقینەم.

دوو منداڵەکەم کە تەمەنیان ٩ساڵان و ١٩ ساڵانە گرنگی بە پێشینەیان دەدەن. ئەو سێیانەمان و هاوسەرەکەم سوپاسگوزار دەبن بۆ هەر زانیارییەکی باکگراوندێك کە تۆ بتوانی پێمان بدەیت. من پرسیارگەلێك دێنە زەینمەوە لەبارەی دایك و باوکی ڕاستەقینەم پەیوەست بە ژیانیان لە ساڵانی گەنجییەوە تاوەکو ئێستا. ئێوە ئارەزوومەندییەکانتان چین و کەسایەتییەکانتان چۆنە؟

لەوەدا کە هەمووومان بەرەو تەمەنی پیری دەچین، ئومێدەوارم بە زوویی بیانبینم. دەشێ ئامادەکارییەکانمان بە ڕێککەوتنێکی هاوبەش بێت. تکایە بزانە کە

من زۆر ڕێز دەگرم لەو نهێنیپارێزییەی کە ئەوان هیواخوازن بەرقەراری بکەن. من خێزانێکی بەخێوکەری بێ وێنەم هەبووە و بڕیاری دایك و باوکی راستەقینەم لە وەختی گەنجییاندا دەنرخێنم. بایەخدانی من راستەقینەیە و بێ سنوور گەرم و گوڕە.

لەبەرچاوگرتننتان بۆ ئەم مەسەلەیە بەرز دەنرخێنرێت.

زۆر دڵسۆزتان،

برای گەورەتان"

پاش چەند هەفتەیەك نامەیەکم لە خانەی بێ دایك و باوکان پێگەیشت. لەلایەن خوشکە راستەقینەکەمەوە بوو.

نوسیبووی "بەڵێ، ئێمە حەز دەکەین بتبینین". یاسای ویلایەتی نۆرس کارۆلاینا رێگر بوو لەوەی کە ئەو هیچ زانیارییەکی ناسینەوە بۆ من بدرکێنێت، بەڵام بە ئیش کردن لە نزیکیی ئەو پێوەرانە ئەو یەکەمین سەرەداوە راستەقینەکانی پێدام لەبارەی ئەو خانەوادە بنچینەییەی کە هەرگیز نەمبینیبوو.

کاتێك وتبووی باوکی راستەقینەم فڕۆکەوانی دەریایی بووە لە ڤێتنام، تووشی سەرسوڕمان بووم: هەربۆیە هەمیشە حەزم لە بازدان بووە لە فڕۆکە و پێمخۆشبووە فڕۆکەی بێ ماتۆڕ بازۆم. هەروەها پێم سەیر بوو کە باوکم بە هەمان شێوە مەشقپێکراوێکی کەشتیوانیی ئاسمانی بووە لە (ناسا) لە ماوەی ئەرکەکانی (ئەپۆلۆ)دا لە ناوەڕاستەکانی ١٩٦٠ەکاندا (خۆشم لە ١٩٨٣دا ئەوەم لەبەرچاو گرتبوو کە وەکو پسپۆڕی ئەرك لەسەر کەشتیی ئاسمانی راهێنان ببینم). باوکی راستەقینەم دواتر وەکو فڕۆکەوانی هێڵی ئاسمانی کاری کردووە بۆ (پان ئام) و (دێلتا).

لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧دا، دواجار دایك و باوکی راستەقینەم، ئان و ریچاردز و خوشك و برا بایۆلۆجییەکانم، کاسی و دەیڤد، بینین. ئان بەسەرهاتی تەواوی ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە چۆن، لە ١٩٥٣دا، سێ مانگی لە خانەی (فلۆرێنس کریتێندێن بۆ دایکانی بێ هاوسەر) بەسەر بردووە کە کەوتووەتە تەنیشت نەخۆشخانەی (شارۆلت مێمۆریەڵ). هەموو کچانی ئەوێ ناوی رەمزییان هەبوو و لەبەرئەوەی حەزی لە مێژووی ئەمریکا بوو، دایکم (ڤیرجینیا دەیەر)ی هەڵبژاردبوو- ناوی یەکەم مناڵی لەدایکبوو لە نیشتەجێکراوانی ئینگلیز لە ئەمریکا. زۆربەی کچان تەنیا بە (دەیەر) بانگیان دەکرد. لە تەمەنی شانزە ساڵیدا، ئەو گەنجترین کچی ئەوێ بوو. ئەو پێی وتم کە باوکی ئامادە بووە هەر شتێکی بۆ بکات بۆ یارمەتیدانی کاتێك بە "تەنگژە"ەکەی زانیووە. ئەو ئامادە بووە کە تەواوی خێزانەکە هەڵبگرێت و بڕوات ئەگەر پێویست بکات. ئەو بۆ ماوەیەك بێکار بووە و هێنانەوەی مناڵێك بۆ ماڵەوە گرفتێکی دارایی گەورەی بەدوای خۆیدا دەهێنا، چ جای کێشەکانی تر.

هاوڕێیەکی نزیکی لە ناوچەی (دیلۆن)ی ساوس کارۆلاینا تەنانەت پێی وتووە کە دکتۆرێك دەناسێت کە دەتوانێت ئەو جۆرە کێشانە "حەل" بکات. بەڵام دایکی ئامادە نەبووە گوێی لەو شتانە بێت.

ئان پێی وتم کە چۆن چاوی بڕیووەتە ئەستێرە درەوشاوەکانی ئاسمانی سەرمایەکی تازە هاتووی شەوێکی کانوونی یەکەمی ١٩٥٣- چۆن لەژێر پەڵە هەورە نزمەکاندا بەسەر جادە چۆڵەکاندا رۆیشتووە. ویستوویەتی ئەم کاتە تەنیا بێت، لەگەڵ مانگ و ئەستێرەکان و ئەو منداڵەی-من- کە بە رێگاوە بووە.

"نیوەمانگ لە خۆرئاواوە نزم بوو. هەسارەی درەوشاوەی مشتەری تازە بەرز دەبووەوە، بۆئەوەی بە درێژایی شەو بەسەرماندا بڕوانێت. ریچارد کەیفی بە زانست

و هەسارەناسی دەهات و دواتر پێی وتم کە ئەو شەوە مشتەری نەیار بووە و بۆ ماوەی تەقریبەن نۆ ساڵ دواتر ئەوەندە درەوشاوە نەدەبوو. دوای ئەو کاتە، شتێکی زۆر لە ژیانماندا روویدەدا، لەوانەش لەدایکبوونی دوو منالّی تر.

"بەلاّم ئەو کاتە تەنیا بیرم لەوە کردەوە کە پاشای ئەستێرەکان چەندە جوان و درەوشاوە دیارە، کە لەسەرەوەڕا لێمان دەڕوانێت".

کاتێك داخلّی لۆبیی نەخۆشخانەکە بووە، بیرۆکەیەکی جادوویی هاتووەتە مێشکیەوە. کچان بە گشتی بۆ دوو هەفتە لە خانەی (کریتێندێن) ماونەتەوە پاش ئەوەی منالّەکەیان بووە، دواتر دەچوونە مالّەوە و ژیانی ئاسایی خۆیان دەست پێدەکردەوە. ئەگەر ئەو بە راستی ئەو شەوە منالّی ببووایە، لەوانەیە من و ئەو بۆ کریسمەس لە مالّەوە بین- ئەگەر ئەوان پاش دوو هەفتە بە راستی ئەویان دەرکردبا. چ موعجیزەیەك دەبوو ئەمە: بە هاتنی رۆژی کریسمەس منی ببردایەتە مالّەوە.

ئان پێی وتم "دکتۆر کراوفۆرد تازە لە هێنانەدنیای منالّێکی تر تەواو ببوو و تەواو ماندوو دیار بوو". ئەو پارچەیەك لەفافی بە گیراوەی ئەسیر لەسەر روخساری دانابوو بۆئەوەی ژانەکەی کەم بکاتەوە، چونکە ئەو تەنیا نیوە ئاگا بوو کاتێك دواجار، لە سەعات ٢: ٤٢ی سەر لەبەیانی بە دوایین پالّنانی گەورە، یەکەمین منالّی ببوو.

ئان پێی وتم زۆر ئارەزوومەندی ئەوە بووە بمگرێتە باوەش و دەستم پیا بێنێت و ئەمەی کە قەت گریانەکانی منی بیر ناچێت تائەوەی کە کاتی بێتاقەتی و دواجار زالّبوونی ئەو بەنجە.

به درێژایی چوار سەعاتی دواتر، یەکەم جار مەریخ، دواتر زوحەل، ئینجا مێرکوری عەتارد ، و دواجار ڤینۆسی درەوشاوە لە لای خۆرهەڵاتی ئاسمانەوە بەرز بوونەتەوە بۆئەوەی لەم جیهانەدا بەخێرهاتنم بکەن. لەهەمان کاتدا، ئان زۆر قووڵتر لە چەند مانگی رابردوو خەو بردبوویەوە.

پەرستارەکە پێش خۆرهەڵاتن خەبەری کردبووەوە.

ئەو بە رووخۆشییەوە وتی "کەسێك هەیە کە دەمەوێ پێتی بناسێنم" و منی خستبووەڕوو، لە بەتانییەکی شینی کاڵەوە پێچابوویانم، بۆئەوەی دایکم سەرسامی خۆی دەربڕێ.

"هەموو پەرستارەکان هاوڕا بوون لەسەرئەوەی کە تۆ جوانترین منالی لە تەواوی دایەنگەکەدا. بەم قسانە لێوانلێو ببووم لە شانازی".

چەندەی ئان ویستی ئەوەی هەبووە من لای خۆی بهێڵێتەوە، ئەوەندەش واقیعە سارد و سڕەکە زیاتر دەهاتەوە بەرچاو. ریچارد خەونی ئەوەی هەبووە بچێتە کۆلێج، بەڵام ئەو خەونانە دادی منیان نەدا. لەوانەیە هەستم بە ئازاری ئان کردبێت، چونکە لە خواردن وەستام. لە رۆژی یانزەهەمدا، بەو نەخۆشییە داخڵی خەستەخانە کرام کە "لە شکستی هەستانەوەدا" بووم و یەکەم کریسمەس و نۆی رۆژی دواترم لە نەخۆشخانە لە (شارلۆت) بەسەر برد.

پاش ئەوەی داخڵی نەخۆشخانە کرام، ئان بە دوو سەعات بە پاس بەرەو باکوور رۆیشت بۆ شارۆچکەی زێدی خۆی. ئەو کریسمەسی لەگەڵ دایك و باوکی، خوشکەکانی و هاورێیانی بەسەر برد کە سێ مانگ بوو نەیبینیبوون. هەموو ئەمەش بەبێ من.

بە هاتنی ئەو کاتەی کە دەستم کردەوە بە خواردن، ژیانی جودام لە ڕێگەدا بوو. ئان هەستی کرد کە کۆنترۆڵی لەدەست دەدات و ئەوان ڕێگەی پێنادەن من گل بداتەوە. کاتێك ڕێك پاش سەری ساڵی نوێ تەلەفۆنی بۆ نەخۆشخانە کردبوو، پێی وترابوو کە من نێردراوم بۆ خانەی بێ دایك و باوکان لە (گرینسبۆرۆ).

ئەو وتی "سپێردراوە بە خۆبەخشێك؟ چەند ناعادیلانەیە ! "

سێ مانگی دواترم لەگەڵ ژمارەیەك منالی تر کە دایکیان نەیانتووانیبوو بیانژێنن لە بەشی ناوخۆییەکی منالاندا بەسەر بردبوو. بێشکەی من لە قاتی دووەمی مالێکی خۆڵەمێشیی شین باوی سەردەمی ڤیکتۆریدا بوو کە بەخشرابووە ڕێکخراوەکە. ئان بە پێکەنینێکەوە پێی وتم، "لەگەڵ ئەوەشدا تەنیا بەشە ناوخۆییەکی منالان بوو".

ئان لەماوەی چەند مانگی دواتردا بە گەشتێکی سێ سەعاتی بە پاش پێنج شەش جارێك سەردانی کردبووم، نائومێدانە لە هەوڵ دانانی پلانێکدا بووە بۆ ئەوەی بتوانێ من لای خۆی بهێڵێتەوە. جارێکیان لەگەڵ دایکی و جارێکی تر لەگەڵ ڕیچارد (هەرچەندە پەرستارەکان تەنیا دەیانهێشت لە پەنجەرەوە بمبینێت— نەیاندەهێشت بێتە ژوورەکە و بە دڵنیاییشەوە نەیاندەهێشت هەڵمگرێت) هات.

بەلام بە هاتنی دوادواکانی ئازاری مانگی ئازاری ١٩٥٤، روون بوو کە شتەکان لە قازانجی ئەودا نین. دەبووایە دەستبەردارم بێت. ئەو و دایکی بۆ دوایین جار بە پاس بەرەو (گرینزبۆرۆ) رۆیشتن.

ئان پێی وتم "دەبووایە هەڵتگرم و چاو ببڕمە چاوەکانت و هەوڵ بدەم هەموو شتەکانت بۆ روون بکەمەوە. دەمزانی هەرچییەکەم بوتایە بزەت دەهات گاڵە گاڵت بوو، بڵقت لە دەمت ئەکردە دەرەوە و دەنگی قایلکەرت دەردەبڕی، بەلام هەستم کرد کە دەبووایە ئەو روونکردنەوەیەم وەربگریت. بۆ دوایین جار لە خۆمم نزیك

کردییەوە، گوێچکەکانت، سنگت و روخسارتم ماچ کرد و بە نەرمی دەستم پیا هێنایت. بیرمە کە بە قووڵی هەناسەم هەڵدەکێشا، کەیفم بەو بۆنەی ساوای تازە شۆراو دەکرد، وەك بڵێی دوێنێ بوو.

"بەو ناوەوە کە لە کاتی لەدایکبوون ناومان نابوویت بانگم کردیت، زۆر خۆشم دەوێی، ئەوەندە زۆر کە قەت نازانیت. بۆ تاهەتایە خۆشم دەوێیت، تا ئەو رۆژەی کە دەمرم".

"وتم، خودایە، تکایە رێگەی بدە بزانێ چەنێك خۆشەویستە. چەنێك خۆشم دەوێ و هەمیشەش هەروا دەبێ. بەڵام هیچ رێگەیەك نەبوو بزانم نزاکەم گیرا دەبێت. ئامادەکارییەکانی گرتنەخۆ لە ١٩٥٠کاندا کۆتاییان پێهاتبوو و زۆر نهێنی بوون. هیچ لاکردنەوەیەك و روونکردنەوەیەك نەبوو. هەندێ جار تۆماری بەروارەکانی لەدایکبوون دەگۆڕدران تەنیا بۆئەوەی هەر هەوڵێك بۆ ئاشکرابوونی سەرچاوەی مناڵەکە شکست بێنێت. هیچ شتێك لەدوای جێ نەمێنێت. رێککەوتننامەکان لە رێگەی یاسای توندی ویلایەتەکەوە دەپارێزران. یاساکە ئەوە بوو کە لەبیری بکەیت کە قەت شتی وا روویداوە و پاشماوەی ژیانی خۆت ببەیتەسەر. و ، ئومێدەوارانە، پەندی لێوەربگریت.

"بۆ دوایین جار ماچێکی ترم کردیت، پاشان بە هێواشی لە بێشکەکەتدا دامنایتەوە. لە بەتانییە بچوکە شینەکەتەوە وەرمپێچایتەوە، دوایین نیگام بڕییە چاوە شینەکانت، پاشان پەنجەم ماچ کرد و خستمە سەر نێوچەوانت. ماڵئاوا ریچارد مایکڵ. خۆشم دەوێیت، دوایین وشەکانی من بوون بۆ تۆ، لانی کەم بۆ ماوەی نیو سەدە".

ئان بەردەوام بوو لە قسەکانی و وتی پاش ئەوەی ئەو و ریچارد هاوسەرگیرییان کردووە و مناڵەکانی تر بەدوادا هاتوون، ئەو زیاتر و زیاتر تەقەلای خستووەتەگەڕ

کاتێك بۆی دەرکەوتووە بووم بە چی. سەرباری ئەوەی کە فڕۆکەوانێکی دەریایی و ئاسمانی بووە، ریچارد پارێزەریش بووە و ئان پێی وابووە ئەمە مۆڵەتی پێدەدات تا ناسنامەی گرتنەخۆی من ئاشکرا بکات. بەڵام ریچارد لەوە جێنتلمانتر بوو کە بگەڕێتەوە سەر ئەو رێککەوتننامەیەی گرتنەخۆ کە لە ساڵی ١٩٥٤دا ئەنجام دراوە و خۆی لە قەرەی مەسەلەکە نەدایەوە. لە سەرەتاکانی ١٩٧٠کاندا، لەکاتێکدا کە جەنگی ڤێتنام هەر لە ئارادا بوو، ئان نەیتووانی بەرواری لەدایکبوونم لە مێشکی دەربکات. من لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٢دا دەبوومە نۆزدە ساڵ. ئایا دەڕۆیشتمە ئەوێ؟ ئەگەر وایە، لەوێ دەبووم بە چی؟ زووتر، پلانم وابوو کە خۆم بۆ مارێنز ناونووس بکەم بۆ فڕۆکەوانی. چاوم ٢٠/١٠٠ بوو و هێزی ئاسمانی پێویستی بە ٢٠/٢٠ بوو بەبێ چەند و چون. لەسەر جادە قسەی ئەوە هەبوو کە مارینز تەنانەت ئەوانەش لە ئێمە وەردەگرێت کە چاویان ٢٠/١٠٠ە و فێری فڕۆکەوانیمان دەکەن. هەرچۆنێك بێت، ئەو کاتە ئەوان دەستیان کرد بە خاوکردنەوەی هەوڵی جەنگ ڤێتنام، بۆیە من قەت ناونووس نەکرام. لەبری ئەوە رووم کردە سکوڵی پزیشکی. بەڵام ئان هیچ کام لەم شتانەی نەدەزانی. لە بەهاری ١٩٧٣دا، ئەوان ئاگادار بوون کە زیندانییانی جەنگ لە ناوچەی "هانۆی هیلتن"ەوە لەو فڕۆکانەوە دادەبەزین کە لە ڤێتنامی باکوورەوە دەگەڕانەوە. ئەوان دڵشکاو بوون کاتێك ئەو فڕۆکەوانە شوێنبزرانەی کە ئەوان دەیانناسین، زیاتر لە نیوەی گروپە دەریاییەکەی ریچارد، لە فڕۆکەکاندا نەبوون و ئان کەوتە مێشکیەوە کە لەوانەیە منیش خۆم لەوێ کوژرابم.

جارێك لە جاران وێنەکەی ناو مێشکی، بزربوونی رەتدەکردەوە و بۆ ماوەی ساڵانێك ئەو لەو قەناعەتەدا بوو کە من مردنێکی تۆقێنەرانە لە کێڵگەکانی برنجی ڤێتنامدا مردووم. بێگومان ئەو تووشی سەرسوڕمان دەبوو کە بزانێ کە ئەو وەختە من تەنیا چەند مایڵێك لەوەوە دوورم لە (چاپڵ هیڵ)!

له هاوینی ٢٠٠٨دا، له کەناراوی (لیچفیلد)ی ساوس کارۆلاینا چاوم کەوت بە باوکە بایۆلۆجییەکەم، (بۆب)ی برای و زاواکەی کە ئەویش ناوی بۆب بوو. بۆبی برا پاڵەوانێکی هێزی دەریایی ناسراو بوو لە ماوەی جەنگی کۆریادا و فڕۆکەوانی تاقیکردنەوە بوو لە دەریاچەی چین (سەنتەری تاقیکردنەوە چەکەکانی هێزی دەریایی لە بیابانی کالیفۆرنیا کە لەوێ شارەزایەتی پەیداکردبوو لە سیستەمی موشەکیی (سایدویندەر) و فڕۆکەی ئێف ١٠٤ی (ستارفایتەرز)ی هاژۆ بوو. لەهەمان کاتدا، بۆبی زاوا لە ئۆپەراسیۆنی (سەن رەن) لە ساڵی ١٩٥٧دا خێراییەکی پێوانەیی تۆمار کردبوو لە هاژۆتنی فڕۆکەی شەڕکەردا. ئەو چاوپێکەوتنانەم لەگەڵ دایك و باوکی راستەقینەم لە کۆتایی هێنا بەو شتەی کە پێم دەوت (ساڵانی نەزانینم). ئەو ساڵانەی کە دواجار زانیم چەندەی بۆ من بەئازار بوون بۆ دایك و باوکی راستەقینەشم هەروا بوون. تەنیا برینێك هەبوو کە سارێژ نەدەبووەوە: پێش دە ساڵ لە ١٩٩٨دا، لەدەستدانی خوشکی بایۆلۆجیم (بێتسی) (بەڵێ، هەمان ناوی یەکێك لە زڕخوشکەکانم، هەردووکیشیان شویان بە رۆب کردبوو، بەڵام ئەمە بەسەرهاتێکی ترە). هەمووان پێیان دەوتم کە ئەو دڵێکی گەورەی هەبووە و ئەو کاتانەی کە لە (سەنتەری تەنگژەی لاقەکردن) کاری نەکردووە کە زۆربەی کاتەکانی تیا بەسەربردووە، زۆرجار خەریکی چاودێریکردن و خواردنپێدانی پۆلێك لە سەگ و پشیلەی بەرەڵا بووە. ئان بە "فریشتەی راستەقینە" ناوی دەبرد. (کاسی) بەڵێنی پێدام کە وێنەیەکیم بۆ بنێرێت. بێتسی وەکو من، ململانێی بووە لەگەڵ کحول و بە ئاگاداربوونەوە لە مردنی، کە بەشێکی بەهۆی ئەو ململانێیانەوە کلپەی سەند، وایلێکردم جارێکی تر درك بەوە بکەم کە چەندە خۆشبەخت بووم لە هەڵبڕینی کێشەی خۆمدا. تامەزرۆی بینینی بێتسی بووم، بۆئەوەی دڵنەوایی بکەم- تا پێ بڵێم کە برینەکان دەشێ سارێژ بن و هەموو شتێك باش دەبێ.

لەبەرئەوەی، هەرچەندە سەیریشە، کاتی دیدار لەگەڵ خانەوادەی راستەقینەم یەکەم جار بوو لە ژیانمدا کە هەستم کرد شتەکان، بەشێوەیەك لە شێوەکان، بە راستی ئاسایی بوون. خانەوادە گرنگ بوو، منیش هی خۆمم–بەشی زۆریم– دەستکەوتەوە. ئەمە یەکەم وانەی راستەقینەم بوو لەوەدا کە زانین لەبارەی بنچینەتەوە دەشێ بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو ژیانت چاك بکاتەوە. زانینی ئەمەی کە لە کوێوە هاتووم، واتە بنچینە بایۆلۆجییەکانم، زەمینەی بۆ خۆشکردم تا ئەو شتانەی ناو خۆم ببینم، و قبووڵ بکەم، کە هەرگیز خەویشم پێوە نەبینیووە کە بتوانم. بە دیداری ئەوان، دواجار رێگەم بۆ خۆش بوو ئەو گومانە درێژخایەنە بەلاوە نێم کە لەگەڵما بوو بەبێ ئەوەی تەنانەت لێشی بەئاگا بم: گومانی ئەوەی کە، لە هەر کوێیەکەوە هاتبم، لە رووی بایۆلۆجییەوە، خۆش نەویستراوم و بایەخم پێنەدراوە. بەشێوەیەکی ناخودئاگایانە، بڕوام وابووە کە شایستەی خۆشویستن نەبووم، یان تەنانەت شایستەی هەبوونیش نەبووم. درك کردن بەوەی کە هەر لە سەرەتاوە خۆشویستراوم، بە قووڵترین شێوە منی سارێژ کردەوە. هەستم بە تەواوەتییەك کرد کە قەت پێشتر نەمزانیبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمە تاکە دۆزینەوەیەك نەبوو لەم بوارەدا ئەنجامم دا. ئەو پرسیارەی تری ئەو رۆژە لەناو ئۆتۆمبێلدا لەگەڵ ئێبێن کە پێم وابوو وەڵامم دراومەتەوە– پرسیاری ئەوەی ئاخۆ بە راستی خودایەکی بەسۆز هەیە– هێشتا مابوو و وەڵامەکە لە مێشکمدا هێشتا نەخێر بوو. تا ئەو کاتەی کە حەوت رۆژم لە کۆمادا بەسەر برد ئینجا گەڕامەوە سەر پرسیارەکە. وەڵامێکی تەواو چاوەڕواننەکراوم لەوێش بەدەستهێنا.

بەشی دوانزەهەم

# چەقەکە

شتێك رایکێشام. وەك شتێك نا کە قۆڵم دەگرێت، بەڵکو شتێکی نادیارتر، کەمتر فیزیکی بوو. کەمێك وەکو ئەوە وابوو کە کاتێك خۆر دەچێتە پشت هەورێك و هەست دەکەیت لە بەرانبەردا دەستبەجێ میزاجت دەگۆڕێ.

من دەگەڕامە دواوە، دوور لە چەقەکە. تاریکاییە مەرەکەب ئاسا درەوشاوەکەی نەدەما و دەگۆڕا بۆ دیمەنێکی سەوزی دەروازەکە، بە هەموو شێوە سەرگێژکەرەکەیەوە. بە روانین بەرەو خوارەوە، جارێکی تر دێهاتییەکان، درەختەکان، جۆگەلە درەوشاوەکان و تاڤگەکانم بینی، لەگەڵ بوونەوەرە فریشتەئاساکانی لەسەرەوە.

هاوەڵەکەشم هەر لەوێ بوو. بێگومان تەواوی ئەو کاتە لەوێ بووە، بەدرێژایی گەشتەکەم بۆ چەقەکە، لە شێوەی ئەو گۆیەی رووناکیدا. بەڵام ئێستا، ئیتر جارێکی تر لە شێوەی مرۆڤدا بوو. هەمان جلە جوانەکانی لەبەردا بوو و جارێکی تر بینینەوەی وایلێکردم هەست بکەم منداڵێکم کە لە شارێکی گەورە و نامۆدا بزر بووە و لەپڕ دێتەوە بەردەم روخسارێکی ئاشنا. چ دیارییەك بوو ئەو! "ئێمە زۆر شتت

پیشان دەدەین، بەڵام تۆ دەگەڕێیتەوە". ئەو پەیامە، کە لە دەروازەی تاریکاییە بێ ڕێڕەوەکەی چەقەکەدا بەبێ وشە گەیشتە لام، ئێستا هاتەوە لام. هەروەها ئێستا تێگەیشتم کە "گەڕانەوە" چییە.

ناوچەی ڕوانگەی چاوی کرم کە تیایدا ئەم گەشتە پڕ ئەزموونەم دەستپێکردبوو. بەڵام ئەمجارەیان جیاواز بوو. ڕۆیشتن بەرەو ناو تاریکی بە زانیارییەکی تەواو لەبارەی ئەوەی لەسەرەوە چی هەیە، چیتر ئەو ترس و دڵەڕاوکێیەم ئەزموون نەکرد کە یەکەم جار لەوێ بووم. لەکاتێکدا کە مۆسیقای شکۆمەندانەی دەروازەکە بەرەو نەمان دەچوو و لێدانە بە ڕیتمەکە ڕووبەری خوارەوە دەگەڕایەوە، وەکو کەسێکی پێگەیشتوو کە شوێنێکی بینیووە یەکەم جار ترساوە و بەڵام چیتر ناترسێت، شتەکانم بینی و بیستەوە. تەم و تاریکییەکە، ئەو روخسارانەی دەرپۆقین و نەمان، ڕەگە شێوە شادەمارەکان کە لەسەرەوە هاتنە خوار، ئێستا چیتر مایەی ترس نین بۆم، چونکە تێگەیشتم– بەبێ وشە ئەو کاتە هەموو شتێك تێگەیشتم– کە من چیتر هی ئەم شوێنە نیم، بەڵکو تەنیا سەردانیم کردووە.

بەڵام بۆچی جارێکی تر سەردانیم دەکردەوە؟

وەڵامەکە هەر بەو شێوازە نازارەکییە دەستبەجێیە هاتەلام کە لە جیهانە بێ هاوتاکەی سەرەوە پێم گەیشتبوون. بەرە بەرە بۆم دەرکەوت، تەواوی ئەم گەشتە جۆرە سەردانێك بووە–جۆرێك لە چاوپێداخشاندنێکی مەزنی لای نەبینراو و ڕۆحیی بوون. وەکو هەموو سەردانە باشەکانیش، هەموو نهۆم و هەموو ئاستەکانی تێدابوو.

کاتێك گەڕامەوە ڕووبەرەکەی خوارەوە، گۆڕانە لەپڕەکانی ناو ئەم جیهانانە لە سەروو ئەوەی کە لەبارەی ئەم زەوییەوە دەیزانم، بەردەوامی هەبوو. بۆئەوەی کەمێك –تەنیا زۆر کەم– بۆی بچیت کە ئەو هەستە چۆن بووە، بیر لەوە بکەوە کە

چۆن کات لە خەونەکاندا خۆی پیادە دەکات. لە خەونێکدا، "پێش" و "پاش" دەبنە دەلالاتی فێڵاوی. تۆ دەتووانیت لە بەشێکی خەونەکەتدا بیت و بزانیت چی دێت، تەنانەت بێ ئەوەی هێشتا ئەزموونیشت کردبێت. "کات"ی من لەوێ شتێکی لەو بابەتە بوو- هەرچەندە دەبێ بەهەمان شێوە تیشك بخەمە سەر ئەوەی کە بەسەر مندا هات ئەو سەرلێشێواوییە تەمومژاوییەی خەونە زەمینییەکانمان نەبوو، لەو حاڵەتانەی زۆر سەرەتادا نەبێت، کاتێك هێشتا لە جیهانی ژێرەوە بووم.

ئەمجارەیان چەند لەوێ بووم؟ جارێکی تر دەڵێم نازانم- رێگایەك نییە بۆ پێوانەکردنی. بەڵام ئەوە دەزانم کە پاش گەڕانەوە بۆ رووبەرەکەی خواری خوارەوە، کاتی زۆری ویست تا بزانم بە راستی کۆنترۆڵێکم بەسەر جوڵەکانمدا هەیە- واتە ئەوەی کە چیتر لەم جیهانەی خوارەوەدا گیرم نەخواردووە. بە تەقەلایەکی بەرجەستە، دەمتووانی بەرەو پانتاییە بەرزترەکان بڕۆم. لە خاڵێکی دیاریکراو لە قووڵاییە تەمومژاوییەکاندا، بۆم دەرکەوت کە هیواخوازی گەڕانەوەی (ئاوازی غەزەلەکە)م. پاش کۆشیشێکی سەرەتایی بۆ بەیادهێنانەوەی نۆتەکان، مۆسیقا جوانەکە، و ئەو تۆپە رووناکییە سوڕاوەی کە لێی دەردەچوو بەناو هۆشیاریمدا شکۆفەی کرد. جارێکی تر تەمومژە جەلی ئاسایەکەیان بڕی و من دەستمکرد بە بەرز بوونەوە.

لە جیهانەکانی سەرەوەدا، بەهێواشی درکم بەوە کرد کە، زانین و تووانینی بیرلێکردنەوە هەموو ئەو شتەیە کە پێویستم پێیەتی بۆئەوەی بەرەو پیری بچم. بیرکردنەوە لە ئاوازی غەزەل، بەدیارخستنی بوو و ئاوات خواستن بۆ جیهانەکانی سەرەوە، گەیاندنی خۆم بوو بە ئەوێ. چەندەی ئاشناتر بوومایە بە جیهانی سەرەوە، ئەوەندە گەڕانەوە بۆی ئاسانتر بوو. لە ماوەی چوونە دەرەوە لە

جەستەم، ئەم جوڵەیەی بەرەودواوە–و–پێشەوەم لە تاریکاییە قوڕاوییەکەی ناوچەی روانگەی چاوی کرم و درەوشاوەییە سەوزەکەی دەروازەکە و چەقە تاریك بەڵام پیرۆزەکە چەندەها جار ئەنجامدا. کتومت ناتووانم بڵێم چەند– ئەمەش جارێکی تر لەبەرئەوەی کە کات بەو پێوانەیەی ئەویَ بۆ تێگەیشتنی زەمینیی ئێمە لە کات تەرجەمە ناکریَ. بەڵام هەر جارێك کە دەگەیشتمە چەقەکە، قووڵتر لە پێشوو دەڕۆیشتم و ، بەبیَ وشە، زیاترم پیَ دەوترا، زیاتر لەو شێوازە زارەکییەی کە لە جیهانەکانی سەرەوەی ئەمە هەموو شتەکان ئاڵوگۆڕ دەکرێن.

ئەمە بەو مانایە نییە کە شتێکی وەکو تەواوی گەردوونم بینیبێت، چ لە ناوچەی بنچینەییم لە ناوچەی روانگەی چاوی کرم بەرەو چەقەکە، یان لەوانەی کە دواتر هاتن. لە راستیدا، یەکێك لەو راستییانەی بۆم دەرکەوت هەر کاتێك کە دەگەڕامەوە بۆ چەقەکە ئەوەبوو کە چەنێك ئەستەمە لە هەموو ئەو شتە تێبگەیت کە هەیە– چ لایەنە فیزیکی/بینراوەکەی یان لایەنە (زۆر، زۆر گەورە) رۆحی/نەبینراوەکەی، چ جای ئەوەی گەردوونە بێشوومارەکانی تر کە هەن یان تا هەنوکە هەبوون.

بەڵام هیچ کام لەوانە گرنگ نەبوون، چونکە من هەنووکە شتێکم پیَ وترابوو– تاکە شتێك– کە دواجار، بە راستی گرنگ بوو. من لە سەرەتاوە ئەم پارچە زانیارییەم لە هاوەڵە دڵگیرەکەمەوە لەسەر باڵی پەپولەکە وەرگرتبوو لەگەڵ یەکەم چوونەناوەوەم بۆ دەروازەکە. بە سیَ بەشیش هات و بۆئەوەی جارێکی تر بیهێنینەوە ناو وشە (چونکە بێگومان لە سەرەتاوە بەبیَ وشە پێم گەیشت)، شتێکی لەوەی خوارەوە بوو:

"تۆ خۆشەویست و بەڕێزیت، تاهەتایە"

"پێویست ناکات لە هیچ بترسیت".

"هیچ شتێك نییە كە هەڵەی تیا بكەیت" .

ئەگەر من تەواوی پەیامەكەم كورت بكردایەتەوە بۆ رستەیەك، ئەوا بەو شێوەیەی خوارەوە دەبوو:

تۆ خۆشەویستیت

و ئەگەریش كورتترم بكردایەتەوە، بۆ تەنیا وشەیەك، ئەوا (بێگومان)، هەروا بە سادەیی ئەمە دەبوو: خۆشەویستی.

بێگومان، خۆشەویستی بنەمای هەموو شتێكە. نەك جۆرێكی ئەبستراكت، پێوانەنەكراوی خۆشەویستی بەڵكو ئەو جۆرە رۆژ لە دوای رۆژەی كە هەمووان دەیزانن– ئەو جۆرەی خۆشەویستی كە ئێمە هەستی پێدەكەین كاتێك دەڕوانینە هاوسەرەكەمان و منداڵەكانمان، یان تەنانەت ئاژەڵەكانیشمان. لە فۆرمە هەرە بێگەرد و بەهێزەكەیدا، ئەم خۆشەویستییە ئیرەیی یان خۆپەرستی تێدا نییە، بەڵكو بێمەرجە. ئەمە واقیعی واقیعەكانە، راستیی بێ پایان شكۆمەندی راستییەكانە كە لە چەقی هەموو شتێك كە هەیە یان دەبێت، دژیت و هەناسە دەدات، و هیچ تێگەیشتنێكی دابڕاو لەوەی كە ئێمە كێین یان چین ناتوانرێ لەلایەن هیچ كەسەوە بەدەست بێت كە نایزانێت و لە هەموو كردارەكانیدا بەرجەستەی ناكات.

تێڕامانێكی زانستی نییە؟ باشە، من هاوڕا نیم. من لەو شوێنەوە هاتوومەوە و هیچ شتێك ناتوانێ لەو قەناعەتە لامبدات كە ئەمە نەك تەنیا تاكە حەقیقەتی هەستیی هەرە گرنگ لە گەردووندا، بەڵكو تاكە راستیی زانستیی هەرەگرنگیشە.

من چەند ساڵێكە بەردەوام باسی ئەزموونەكەم دەكەم، هەروەها چاوم بەو كەسانەش دەكەوێ كە تاووتوێ یان بە ئەزموونەكانی نزیكە مەرگدا تێپەڕیوون.

دەزانم کە زاراوەی خۆشەویستیی بێ مەرج لەو بازنانەدا زۆر دێتە بەر باس. چەنێك لە ئێمە دەتوانێت درك بەوە بکات کە ئەوە بە راستی چ مانایەکی هەیە؟

بێگومان، دەزانم بۆچی زاراوەکە ئەوەندە دێتە بەر باس. لەبەرئەوەیە کە خەڵکێکی یەکجار زۆری تر ئەوەی کە من بەسەرم هاتووە بینیوویانە و ئەزموونیان کردووە. بەڵام وەکو من، کاتێك ئەو خەڵکانە دەگەڕێنەوە سەر زەوی، بە دەست وشەوە گیر دەخۆن و تەنیا وشە، بۆ گەیاندنی ئەو ئەزموون و تێگەیشتنانەیان کە بە تەواوی دەکەوێتە سەروو هێزی وشەکانەوە. ئەمە وەکو نووسینی رۆمانێکە تەنیا بە نیوەی ئەلفبێ.

کۆسپی سەرەکی کە دەبێتە زۆربەی کەسانی (ئەزموونی نزیکە مەرگ) بەسەریدا باز بدەن ئەوە نییە کە چۆن خۆیان لەگەڵ سنووربەندییەکانی جیهانی زەمینی بگونجێننەوە– هەرچەندە بە دڵنیاییەوە ئەمەش کێشەیەك دەبێ– بەڵکو ئەوەیە کە ئەو خۆشەویستییەی لەوێ ئەزموونی دەکەن بە راستی چ هەستێك دەبەخشێ.

ئێمە لە قووڵایی ناخماندا هەنووکە دەزانین. هەروەکو (دۆرۆسی) لە (جادووگەری ئۆز)دا توانای ئەوەی هەبوو بگەڕێتەوە ماڵەوە، ئێمە توانای ئەوەمان هەیە بەو پانتاییە نموونەییە دەتوانیت پەیوەندییەکانمان چاك بکەینەوە. ئێمە هەر بیرمان دەچێ ئەوە بکەین، چونکە لە مەودای ئەو بەشە جەستەییە بونیادگرتووەی مێشکدا، مێشکمان باکگراوندە گەردوونییەکە دەکاتە دەرەوە یان دادەپۆشێت، هەروەکو چۆن رووناکیی خۆر هەر بەیانییەك دەرکەوتنی ئەستێرەکان دادەپۆشێت. وێنای ئەوە بکە کە بینینمان بۆ گەردوون چەنێك سنووردار دەبوو ئەگەر ئاسمانی پڕئەستێرەی شەومان قەت نەبینیایە.

ئێمە تەنیا دەتوانین ئەو شتانە ببینین کە بێژنگی مێشکمان رێگەی پێدەدات. مێشك– بەتایبەت ئەو بەشەی لای چەپ کە زمانەوانی/لۆجیکییە، کە ئەقڵانیەتمان

و هەستی دیاریکراوی خودێتی یان نەفسمان بەرهەم دێنێت– تەگەرەیەکە لەبەردەم زانین و ئەزموونی بالاترمان.

بڕوام وایە کە ئێمە لە ئێستادا ڕووبەڕووی کاتێکی چارەنووسسازی بوونمان دەبینەوە. ئێمە پێویستمان بەوەیە کە بەشێکی زیاتری ئەو زانینە بالایە بەدەست بێنینەوە لەکاتێکدا کە لێرە لەسەر زەوی دەژین، لەکاتێکدا کە مێشکمان (بە لای چەپی بەشە ئەقلانییەکەیەوە) بە تەواوی ئیش دەکەن. زانست– ئەو زانستەی کە بەشی هەرە زۆری ژیانم بۆی تەرخانکردووە– هاودژ نییە لەگەڵ ئەوەی کە لەوێ فێری بووم. بەلام ژمارەیەکی یەکجار، یەکجار زۆری خەڵکی پێیان وایە کە دژیەک دێتەوە، چونکە ژمارەیەکی دیاریکراوی ئەندامانی کۆڕی زانستی، کە خۆیان پابەند کردووە بە جیهانبینی مەتریالیستی، دیسان و دیسان سوور بوون لەسەر ئەوەی کە زانست و رۆحانیەت ناتوانن پێکەوە هەڵبکەن.

ئەوان لە هەڵەدان. من ئەم کتێبەم نووسیووە بۆئەوەی ئەم ڕاستییە کۆنە بەلام سەرەنجام بنچینەییە فراوانتر بلاو بکەمەوە و ئەمە هەموو لایەنەکانی بەسەرهاتەکەم بە تەواوی دەکاتە– ڕازی ئەوەی کە چۆن تووشی نەخۆشییەکەم بووم، چۆن لە ڕەهەندێکی تردا بەئاگاهاتمەوە لەو هەفتەیەدا کە لە کۆمادا بووم و چۆن بەشێوەیەك لە شێوەکان بە تەواوی چاك بوومەوە– شتێکی لاوەکی.

ئەو خۆشەویستییە بێ مەرجە و ئەو قبوڵکردنەی لە گەشتەکەمدا ئەزموونم کرد تاکە دۆزینەوەی هەرە گرنگە کە تاوەکو ئێستا ئەنجامم داوە یان دواتر ئەنجامی بدەم و لەکاتێکدا کە دەزانم چەنێك سەختە کە ئەو وانانەی تر کە لەوێ فێریان بووم والا دەکات، بەهەمان شێوە لە ناخی دڵمدا دەزانم کە بلاوکردنەوەی ئەم پەیامە زۆر بنچینەییە– پەیامێکی ئەوەندە سادە کە زۆربەی منالان هەنوکە بە ڕاستی دەزانن– گرنگترین ئەرکێکە کە لەسەر شانمە.

بەشی سیانزەهەم

# چوارشەممە

بۆ ماوەی دوو ڕۆژ، "چوارشەممە" وشەیەکی مەتەڵئامێز بوو- ئەو ڕۆژەی سەر لێوی دکتۆرەکان کاتێك هاتنە سەر باسی ئەگەرەکانی رزگاربوونم. هەروەکو لەمەدا: "ئێمە هیوادارین تاوەکو ڕۆژی چوارشەممە باشبوونێك بەدی بکەین". ئێستاش ئەوە چوارشەممە بوو، بەبێ تروسکاییەکی گۆڕان لە بارودۆخمدا.

"کەی دەتوانم باوکم ببینم؟ "

ئەم پرسیارە- ئاساییە بۆ منالێکی دەساڵان کە باوکی لە نەخۆشخانەیە- زووزوو لە دەمی بۆندەوە دەردەچوو لەو وەختەوە کە ڕۆژی دووشەممە کەوتبوومە کۆماوە. هۆڵی بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە بۆ ماوەی دوو ڕۆژ خۆی ڕاگرتبوو، بەڵام بەرەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە، بڕیاریدا کە کاتی موخاتەبەکردنی هاتووە.

کاتێك هۆڵی لە شەوی دووشەممەدا بە بۆندی وتبوو کە من هێشتا لە نەخۆشخانە دەرنەکراوم لەبەرئەوەی "نەخۆش"م، ئەو لە خەیاڵی خۆیدا داینابوو کە ئەو وشەیە هەمیشە چ مانایەکی بۆی هەیە، تاوەکو ئەم ساتەوەختە لە دەیەمین ساڵی تەمەنیدا: کۆکەیەك، ئاوسانێکی قوڕگ- لەوانەیە سەرئێشە بێت. بەڵام، درککردنی

بەوەی کە دەبێ سەرئێشە بە راستی چەنێك ئازاربەخش بێ، لە بەرەبەیانی دووشەممەدا بەشێوەیەکی کاریگەر فراوان ببوو. بەڵام کاتێك هۆڵی دواجار لەو پاش نیوەڕۆیەی چوارشەممەدا هێنای بۆ نەخۆشخانە، هێشتا هیوادار بوو رووبەڕووی شتێکی زۆر جیاواز بێتەوە لەوەی کە لە پێخەفی نەخۆشخانەی مندا بینیبووی.

بۆند جەستەیەکی بینی کە هاوشێوەییەکی زۆر دووری هەبوو لەگەڵ ئەوەیاندا کە وەکو باوکی بینیبووی. کاتێك کەسێك دەخەوێت، دەتووانی سەیری بکەیت و بزانیت کە هێشتا کەسێك لەو جەستەیەدا جێگیرە. ئامادەییەك هەیە. بەڵام زۆربەی دکتۆرەکان پێت دەڵێن کە کاتێك کەسێك لە کۆمادایە جیاوازە (ئەگەرچی کتومت پێشت نەڵێن بۆ). جەستەکە لەوێیە، بەڵام هەستێکی سەیر و تەقریبەن فیزیکی هەیە کە کەسەکە لەوێ نییە. ئەمەی کە جەوهەریان، بێ ئەوەی قابیلی روونکردنەوە بێ، لەشوێنێکی ترە.

ئێبێنی چوارەم و بۆند هەمیشە زۆر لە یەکەوە نزیك بوون، لەو ساتەوە کە ئێبێن رایکردبوو بۆ لای بێشکەکە کاتێك بۆند تەمەنی تەنیا چەند خولەکێك بوو و برا تازەکەی گرتبووە ئامێز. ئێبێن ئەو سێیەم رۆژەی کۆماکەم چاوی بە بۆند کەوت و هەرچی بۆی کرا کردی بۆئەوەی بارودۆخەکە بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ بۆ برا بچوکەکەی لەقاڵب بدات. و لەبەرئەوەی خۆی بە زەحمەت لە منالێك تێپەڕاندبوو، سیناریۆیەکی دارشت کە پێی وابوو بۆند دەتووانێ درکی پێ بکات: شەڕێك.

بۆیە لەسەر مێزەیەك لە شوێنی نان خواردنی نەخۆشخانەکە، پارچەیەك کاغەزی پرتەقاڵییان دانا و نمایشێکیان هێڵکاری کرد بۆئەوەی کە لە جەستەی کەوتووە ناو کۆمای من روودەدات. ئەوان وێنەی خڕۆکە سپییەکانی منیان کێشا، زرێیان پۆشیبوو و شمشێریان بەدەستەوە بوو، بەرگریان لە ناوچەی گەمارۆدراوی مێشکم

دەکرد. هەروەها وێنەی ئی. کۆلای-یان کێشا کە پۆشاکی کەمێك جیاوازیان لەبەردابوو و شمشێریان بەدەستەوە بوو. شەڕێکی دەستەویەخە لەئارادابوو و جەستەی کوژراوانی هەردوو لا لەملاو لەولا کەوتبوو.

ئەمە بە شێوازی خۆی، بایی پێویست نوواندنێکی کتومت بوو. تاکە شتێك کە تیایدا دەقاودەق نەبوو، بە لەبەرچاوگرتنی سادەکردنەوەی ئەو رووداوە بە ئاشکرا زۆر ئالۆزەی لەناو جەستەمدا روویدەدا، شێوازی بەڕێوەچوونی شەڕەکە بوو. لە تەرجەمەکەی ئێبێن و بۆند دا، شەڕەکە زۆر بەرفراوان و زۆر گەرم بوو لەبارێکدا کە هەردوو لا ململانێیان بوو و دەرەنجام دیار نەبوو- هەرچەندە، بێگومان، دواجار خڕۆکە سپییەکان براوە دەبوون. بەڵام لەکاتێکدا کە ئەو لەگەڵ بۆند دانیشت، ماجیکە رەنگاورەنگەکان لەسەر مێزەکە دانرابوون، لە هەوڵی ئەوەدا کە ئەم دیمەنە ساویلکانەیەی رووداوەکان باس بکات، ئێبێن دەیزانی کە لە راستیدا، شەڕەکە چیتر فراوان نییە یان ئەوەندە نادڵنیا نییە.

و دەیزانی کە کام لایە دەیباتەوە.

بەشی چواردەهەم

# جۆرێکی تایبەتی ئەزموونی نزیکە مەرگ

بەهای راستەقینەی مرۆڤ بەشێوەیەکی سەرەکی
بەهۆی ئەو پێوەر و دۆخە دیاری دەکرێت کە بەهۆیەوە
ئازادی لە خۆی بەدەستهێناوە.
ئالبێرت ئەنیشتاین (١٨٧٩–١٩٥٥)

کاتێك من لە سەرەتادا لە ناوچەی روانگەی چاوی کرم بووم، ئاگاییم سەنتەرێکی راستەقینەی نەبوو. نەمدەزانی کێم یان چیم، یان تەنانەت (ئاخۆ) منم. تەنیا. . . (لەوێ) بووم، هۆشیارییەکی بە تەنیا لە ناوەڕاستی نەبوونییەکی شێدار و ناخۆشی تاریکی قوڕاوی کە دەستپێك و لە رواڵەتدا کۆتاییشی نەبوو.

ئێستا، هەرچۆنێك بێت، زانیبووم. تێگەیشتم کە بەشێکم لە عەرشی ئیلاهی و ئەمەی کە هیچ شتێك–بەشێوەیەکی رەها هیچ شتێك– قەت ناتووانێت ئەمە نەهێڵێت. ئەو گومانە (هەڵە)یەی کە دەشێت ئێمە بەشێوەیەك لە شێوەکان لە خوداوەند جیا بکرێینەوە ڕەگی هەموو فۆرمێکی شڵەژانە لە گەردووندا و چارەسەرەکەی– کە من بەشێوەیەکی رێژەیی لەناو دەروازەکە و بەتەواوی لەناو چەقەکە بەدەستم هێنا– زانینی ئەوە بوو کە هیچ شتێك ناتوانێت هەرگیز لە خوداوەند دامانبڕێت. ئەم زانینە– و هەر وەکو تاکە شتێکی هەرە گرنگ کە تاوەکو

ئێستا فێری بوو‌بێتم دەمێنێتەوە– ناوچەی روانگەی چاوی کرمی لە ترس و تۆقین داماڵی و رێگەی پێدام تا بزانم بە راستی چییە: بەشێکی تەواو خۆش نا، بەڵام بێگومان زەرووری گەردوون.

زۆرێك لە خەڵکی بۆ ئەو ناوچانە سەفەریان کردووە کە من سەفەرم بۆ کردبوو، بەڵام سەیرە کە زۆربەیان شوناسی زەمینییان لەیاد بووە کاتێك لە دەرەوەی فۆرمە زەمینییەکانیاندا بوون. ئەوان زانیوویانە کە جۆن سمیس یان جۆرج جۆنسن یان سارا براون–ن. هەرگیز زانینیان بۆ ئەو راستییە لەدەست نەداوە کە لەسەر زەوی ژیاون. ئەوان بەئاگا بوون لەوەی کە کەس و کاری زیندوویان هێشتا لەوێن، چاوەڕێن و هیوادارن بگەڕێنەوە. هەروەها، لە زۆر حاڵەتدا، ئەو کەس و کارانەیان بینیووە کە پێش ئەوان مردوون و لەم حاڵەتانەشدا، دەستبەجێ ئەو کەسانەیان ناسیووەتەوە.

زۆرێك لە کەسانی خاوەن ئەزموونی نزیکە مەرگ باسیان لەوە کردووە کە دەستەویەخەی چاوپێداخشاندنەوە بە ژیان بوون کە تیایدا رەفتاریان لەگەڵ خەڵکی جیاجیا و کرداری باش و خراپی خۆیان لە ماوەی ژیانیاندا هاتووەتەوە بەرچاو.

من هیچ کام لەو رووداوانەم ئەزموون نەکرد و هەمووی کۆ بکەیتەوە تاکە لایەنێکی هەرە نائاسایی ئەزموونی نزیکە مەرگم پیشان دەدات. من بە تەواوی دابڕابووم لە سەرتاپای شوناسی جەستەییم، بۆیە هەر رووداێکی ئەزموونی نزیکە مەرگی کلاسیك کە پەیوەندی بە بیرهاتنەوەم هەبێ بۆئەوەی من لەسەر زەوی کێ بووم، بە تەواوی بزرە.

دەزانم وتنی ئەمەی کە لەو خاڵەی بەرەوپێشچوونەکاندا هێشتا نازانم کێ بووم و لە کوێوە هاتووم، تا رادەیەك سەرلێشێوێنەرە. دواجار، چۆن دەبێ هەموو ئەو

شته بێ ڕاده ئاڵۆز و جوانانه فێربم، چۆن دەتووانم ئەو کچەی تەنیشتم و درەختە شکۆفەکردووەکان و تاڤگەکان و دێهاتییەکان ببینم و هێشتا نەزانم ئەوە من، ئەلێکزاندەر ئێبێن بووم کە ئەزموونی دەکردن؟ چۆن دەمتووانی هەموو ئەو شتانە تێبگەم کە دەمکردن، لەگەڵ ئەوەشدا درك بەوە نەکەم کە لەسەر زەوی دکتۆر، مێرد و باوك بووم؟ کەسێك کە درەختەکان و ڕووبارەکان و هەورەکانی نەدەبینی کاتێك بۆ یەکەم جار من داخڵی دەروازەکە بووم، بەڵکو ئەو کەسەی کە زیاتر لە پشکی خۆی لێیان بینیبوو کاتێك منداڵێکی ڕووڵەگەشە بوو لە ناوچەی زۆر کۆنکریتی و زەمینیی (وینستن سالەم)ی نۆرس کارۆلاینا؟

باشترین وەڵامم ئەوەیە کە بڵێم من لە حاڵەتی کەسێکدا بووم کە تووشی لەبیرچوونەوە(فقدان زاکیرە)ی ڕێژەیی بەڵام بەکەڵك بووە. واتە، کەسێك کە لایەنێکی سەرەکی لەبارەی خۆی بیرچووەتەوە، بەڵام سوود لەو لەبیرچوونەوەیە وەردەگرێت، ئەگەرچی بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت.

چۆن دەستکەوتم هەبوو لە بیرنەهاتنەوەی خودی زەمینییەکەم؟ ڕێگەی بۆ خۆش کردم تا قووڵ بچمە ناو ئەو پانتاییانەی سەروو جیهانی، بەبێ ئەوەی نیگەرانی ئەوە بم چیم لەدوای خۆم جێ هێشتووە. بە درێژایی کاتەکەم لەو جیهانانەدا، من گیانێك بووم کە هیچم نەبوو لەدەستی بدەم. هیچ شوێنێکم نەبوو بیری بکەم، کەس و کارێکم نەبوو بۆی بناڵێنم. من لە ناشوێنەوە هاتبووم و مێژوویەکەم نەبوو، بۆیە بارودۆخەکەمم – تەنانەت تەم و شێواوییە سەرەتاییەکەی ناوچەی ڕوانگەی چاوی کرمیش– بە هێمنییەوە بەتەواوی قبوڵ کرد.

و لەبەرئەوەی زۆر بە تەواوی شوناسی مردووم لەبیر چووبووەوە، بە تەواوی دەستم گەیشتبوو بەو ڕاستییە گەردوونییەی کە من بە واقعی کێم (و ئێمە هەمووومان بە واقیعی کێین). جارێکی تر، لە هەندێ ڕووەوە ئەزموونەکەی من

هاوشێوە بوو لەگەڵ خەودا، کە تیایدا تۆ هەندێ شتت لەبارەی خۆتەوە دێتەوە یاد لەکاتێکدا کە شتەکانی تر بە تەواوی لە یاد دەکەیت. بەڵام جارێکی تریش، ئەمە تەنیا هاوشێوەییەکی کەمێك بەکەڵکە، چونکە، هەروەکو چۆن بەردەوام پێداگری لەسەر دەکەم، دەروازەکە و چەقەکە تۆزقاڵێکیش خەون ئاسا نەبوون، بەڵکو سەروو واقیعی بوون– یەکجار دوور لەوەی کە مرۆڤ خەیاڵپڵاوی بێت. بەکارهێنانی وشەی دابڕاو، وایلێدەکات وەك بڵێی بزریی یادەوەرییە زەمینییەکانم لەکاتی بوونم لە ناوچەی روانگەی چاوی کرم، دەروازەکە و چەقەکە بەشێوەیەك لە شێوەکان بەمەبەست بووە. ئێستا وای بۆدەچم ئەمە کەیسەکە بێت. هەرچەندە لەرادەبەدەر سادەکردنەوەیە، من تەقریبەن لە هەموو کەسانی تری ئەزموونی نزیکە مەرگی پێش من رێگەم پێدرا تا سەختتر بمرم، قووڵتر سەفەر بکەم.

هەرچەندە ئەمە خۆپەرستانە دەردەکەوێت، بەڵام نیازەکانم وا نین. ئەدەبیاتی دەوڵەمەندی ئەزموونەکانی نزیکە مەرگ گرنگ کەوتنەوە بۆ گەشتەکەی من لە کۆمادا. ناتووانم بانگەشەی ئەوە بکەم کە دەزانم بۆ ئەو ئەزموونەم هەبووە، بەڵام لە خوێندنەوەی ئەدەبیاتی تری ئەزموونی نزیکە مەرگ ئێستا (سێ ساڵ دواتر) دەزانم کە چوونە ناو جیهانە باڵاکان پرۆسەیەکی پەیتا پەیتایە و پێویستی بەوەیە کە تاکەکەس وابەستەیی خۆی بە هەر ئاستێکەوە کە لەسەریەتی وازلێبێنێت بەرلەوەی بچێتە ئاستە بەرز یان قووڵەکان.

ئەمە کێشەیەك نەبوو بۆ من، چونکە لە سەرانسەری ئەزموونەکەمدا هیچ یادەوەرییەکی زەمینیم نەبوو و تاکە ئازار یان ژانەسەرێك کە هەستم پێیکرد ئەو کاتە بوو کە دەبووایە بگەڕێمەوە سەر زەوی، ئەو شوێنەی کە لێمەوە دەست پێکردبوو.

بەشی پانزەهەم

# نیعمەتی بیرچوونەوە

پێویستە ئێمە بڕوا بە ئیرادەی سەربەست بێنین.
ڕێگەچارەی ترمان نییە.
ئیسحاق ب. سینگەر (١٩٠٢-١٩٩١)

ئەو تێڕوانینەی لەمەڕ ئاگایی مرۆڤ کە زۆربەی زانایانی ئەمڕۆ هەیانە، ئەوەیە کە لە زانیاریی دیجیتاڵی پێکهاتووە- ئەو داتایەی کە، لە جەوهەردا هەمان ئەو جۆرەیە کە لەلایەن کۆمپیوتەرەکانەوە بەکاردێت. هەرچەندە لەوانەیە هەندێ بڕی ئەم داتایە- بینینی خۆرئاوابوونێکی بێ هاوتا، گوێبیستبوونی سەمفۆنییەک بۆ یەکەمین جار، تەنانەت کەوتنەداوی خۆشەویستی- بەلامانەوە هەستێکی قووڵتر یان تایبەتی هەبێ بە بەراورد بەو بڕە بێشومارانەی تر کە لە مێشکماندا دروست دەبێ و خەزن دەبێ، ئەمە بە ڕاستی تەنیا وەهمێکە. لە ڕاستیدا، هەموو بڕەکان لە ڕووی چۆنایەتییەوە یەکن. مێشکمان لە دەرەوەی واقیعدا لە ڕێگەی وەرگرتنی ئەو زانیارییەی کە لە هەستەکانماندا دێتەناوەوە و گۆڕینی بۆ چنراوێکی دیجیتاڵی

دەوڵەمەند، بەرجەستە دەبێت. بەڵام وەرگیراوەکانمان (لەرێگەی هەستەکانەوە) تەنیا بەرجەستەبوویەکن- خودی واقیع نین. (وەهم)ێکن.

بێگومان ئەمە، تێڕوانینی منیش بوو. بیرمە کە لە سکوڵی پزیشکی بووم و ناوبەناو ئەو بەڵگاندنەم دەبیست کە ئاگایی شتێك نییە جگە لە پرۆگرامێکی کۆمپیوتەریی ئاڵۆز. ئەم بەڵگاندنانە دەیانگوت ئەو دە ملیارد دەمارەخانەیەی کە بە بەردەوامی لە ناو مێشکماندا تریشقە ئاراستە دەکەن، دەتووانن تەمەنێك لە ئاگایی و یادەوەری بەرهەم بهێنن.

بۆئەوەی لەوە تێبگەین کە چۆن مێشك دەشێ بە راستی دەست گەیشتنمان بە زانیاریی جیهانەکانی سەرەوە بەربەست بکات، پێویستە ئێمە قبوڵمان بێت- لانی کەم بەشێوەیەکی گریمانەیی و بۆ ئەم ساتە- کە مێشك ئاگایی بەرهەم ناهێنێت. لەبری ئەمە، مێشك جۆرێك فلتەر یان دەرچەی کەمکەرەوەیە، ئەو ئاگاییە گەورە نافیزیکییەی کە ئێمە لەمەڕ جیهانە نافیزیکییەکان هەمانە وەردەچەرخێنێت بۆ توانایەکی سنووردار لە ماوەی ژیانی کورتماندا. لە روانگەی زەمینیی ئێرەوە، ئەمە سوودێکی دڵنیای هەیە. وەکو چۆن مێشکمان هەر ساتێکی ژیانی بێدارمان سەخت ئیش دەکات بۆ لەبێژنگدانی ئەو زانیارییە هەستەوەرییەی لە دەوروبەری فیزیکییەوە بۆمان دێت، کە هەڵبژاردنی ئەو ماددەیەیە کە بە راستی پێویستمانە بۆ مانەوە، بەهەمان شێوە بیرچوونەوەی شوناسە زەمینییەکانمان رێگەمان پێدەدات یەکجار زۆر کاریگەرتر "لەئێستادا و لێرە بین". هەروەکو چۆن بەشی زۆری ژیان زۆر لەوە زیاتر زانیاری بۆ ئێمە هەڵدەگرێت کە لەپڕ وەریگرین و لەگەڵ ئەوەشدا هەرشتێك هەبێ بیکەین، لەڕادەبەدەر بەئاگابوون لە جیهانەکانی سەروو ئێرە و ئێستا، بەرەوپێشچوونمان تەنانەت خاوتر دەکاتەوە. ئەگەر ئێستا یەکجار زۆرمان

لەبارەی پانتایی رۆحی بزانیایە، ئەوا دەست و پەنجە نەرمکردن لەگەڵ ژیانمان لەسەر زەوی تەنانەت لەو تەحەدییەی هەنووکە گەورەتر دەبوو. (ئەمە بەو مانایە نییە کە بڵێین نابێ بەئاگا بین لە جیهانەکانی سەروو ئێستا- تەنیا ئەوە نەبێ کە ئەگەر لە مەزنایەتیی و گەورەییان سەرووئاگا بین ئەوا لەوانەیە رێگر بن لە کردار لەکاتێکدا کە هێشتا لەسەر زەوین). لە روانگەیەکی مەبەستدارترەوە (و ئێستا بڕوام وایە کە گەردوون هیچ نییە ئەگەر مەبەستدار نەبێ) بڕیاردانی دروست لە رێگەی ئیرادەی سەربەستمانەوە بەرانبەر خراپە و نادادپەروەری لەسەر زەوی مانایەکی یەکجار کەمتری دەبێ ئەگەر، لەکاتێکدا لێرەین، ئەو نایابی و جوانییە تەواوەمان هاتەوەبیر کە چاوەڕوانمانە.

بۆچی من ئەوەندە لەهەموو ئەو شتە دڵنیام؟ لەبەر دوو هۆکار. یەکەم لەبەرئەوەی پیشانمدراوە (لەلایەن بەو بوونەوەرانەوە کە فێریان کردم کاتێك لە دەروازەکە و لە چەقەکەدا بووم) و دووەم لەبەرئەوەی کە بە واقیعی ئەزموونم کرد. لەکاتێکدا کە لە دەرەوەی جەستەمدا بووم، من زانینم لەبارەی سروشت و بونیادی ئەو گەردوونە وەرگرت کە تەواو لە دەرەوەی پەیپێبردنم بوو. بەڵام من، بەشێوەیەکی سەرەکی، لەبەرئەوە وا بە بەربڵاوی وەرمگرت چونکە بواری وەرگرتنیم هەبوو، لەکاتێکدا کە قاڵبوونی جیهانیم نەبوو. ئێستا کە گەڕاومەتەوە سەر زەوی و شوناسی جەستەییم لەبیرە، تۆوی ئەو زانینە سەروو زەوییە جارێکی تر رووپۆش بووەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لە شوێنی خۆیەتی. لە هەر ساتێکدا بێت دەتوانم هەستی پێ بکەم. لەم ژینگە زەمینییەدا ساڵانێك دەخایەنێت تا بەر دەگرێت. واتە، ئەگەر مێشکی مرۆیی ماددیم بەرکابێنم، ساڵانێکم پێدەچێت تا لەوە تێبگەم کە دەستبەجێ و بە ئاسانی لە پانتاییەکانی دەرە مێشکی جیهانی سەرەوە

تێیگەیشتم. لەگەڵ ئەوەشدا، من دڵنیام کە بە کۆششکردن لەلایەن خۆمەوە، بەشی زۆری ئەو زانینە هەر لە دەرکەوتندا دەبێ.

کە بڵێین هێشتا درزێك هەیە لەنێوان تێگەیشتنی زانستیی هەنووکەییمان لەمەڕ گەردوون و ئەو راستییەی کە من بینیم، بەسووك سەیرکردنێکی گەورەیە. من هێشتا حەزم لە فیزیا و گەردووونناسییە. هێشتا حەزم لە تاووتوێکردنی گەردوونی مەزن و سەرسوڕهێنمانە. ئەوە نەبێ کە لە ئێستادا من تێگەیشتنێکی زۆر فراوانبووم هەیە لەوەی کە "مەزن" و "سەرسوڕهێن" بە راستی چ مانایەکیان هەیە. دیوی فیزیکیی گەردوون وەکو پەڵەیەکی تۆزە ئەگەر بەراوردی بکەیت بە دیوە نەبینراوە رۆحییەکە. لە تێڕوانینی پێشوومدا، (رۆحی) وشەیەك نەبوو کە لە وتوێژی زانستیدا بەکاربهێنرێ. ئێستا پێم وایە وشەیەکە کە ناتووانین خۆی لێ ببوێرین.

لە چەقەکەوە، پێدەچێ تێگەیشتنم لەوەی کە پێی دەڵێین "وزەی تاریك" و "ماددەی تاریك" بە روونی مایەی روونکردنەوە بێ، هەروەکو ئەو بڕگە هەرە پێشکەوتووانەی پێکهاتەی گەردوونمان کە سەردەمانێکە مرۆڤەکان قسەی لەسەر ناکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمە بەو مانایە نییە کە من دەتووانم بۆ ئێوەی روون بکەمەوە. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە– بەشێوەیەکی ناکۆکئامێز– من خۆم هێشتا لە پرۆسەی تێگەیشتنیاندام. لەوانەیە باشترین رێگەی گەیاندنی ئەو بەشەی ئەزموونەکە ئەوە بێت بڵێین کە من تامێکی جۆرێکی گەورەتری زانینم کرد: ئەوەیان کە بڕوام وایە مرۆڤەکان دەتووانن لە ئایندەدا بە ئاستێکی زیاتر دەستیان پێی بگات. بەڵام خستنەڕووی ئەو زانینە لە ئێستادا وەکو ئەوە وایە شامپانزییەك لە یەك رۆژدا ببێت

بە مرۆڤ و ئەزموونی هەموو ئەو شتە سەیرەکانی زانینی مرۆیی بکات و پاشان بگەڕێتەوە ناو هاوەڵە شامپانزەکانی بۆئەوەی پێیان بڵێت زانینی ژمارەیەك زمانی رۆمانسیی جیاواز، ژمێریاری و ئاستی بەرفراوانی گەردوون چۆنە.

لەوێ لەسەرەوە، پرسیارێك دەهاتە زەینمەوە و لەهەمان کاتدا وەڵامیش دەهات، وەکو گوڵێك کە راستەوخۆ لە تەنیشتتەوە هەڵتۆقێت. تەقریبەن رێك وەکو ئەوە وابوو کە، هەروەکو چۆن هیچ تەنێکی فیزیکی لە گەردووندا بە راستی لەیەکێکی تر دابڕاو نییە، بەهەمان شێوە شتێك نەبوو بەناوی پرسیار بەبێ وەڵامێکی هاوەڵ لەگەڵیدا. ئەم وەڵامانە تەنیا "بەڵێ" یان "نەخێر"ی سادەش نەبوون. ئەمانە باڵەخانەی چەمکیی مەزن بوون، بونیادی مەزنی بیر بوون، ئەوەندەی شارەکان تێکچڕژاو بوون. ئایدیاکان ئەوەندە گەورە بوون کە چەندەها تەمەنی دەویست بۆم تاوەکو رێگام بدۆزمەوە ئەگەر لە بیرکردنەوەی زەمینیمدا قەتیس بام. بەڵام وا نەبووم. من ئەو ستایلە زەمینییەی بیرکردنەوەم لە خۆم داماڵیبوو وەکو چۆن پەپولە لە قۆزاخەکەی دێتە دەرەوە.

زەویم وەکو خاڵێکی شینی زردباو لە تاریکایی مەزنی بۆشایی فیزیکیدا بینی. دەمتووانی ئەوە ببینم کە زەوی شوێنێکە تیایدا چاکە و خراپە ئاوێتە بووە و ئەمە یەکێك لە تایبەتمەندییە ناوازەکانیەتی. تەنانەت لەسەر زەوی چاکە و خراپەیەکی یەکجار زۆر هەیە، بەڵام زەوی شوێنێکە کە خراپە تیایدا رێگەی پێدراوە کاریگەری بەدەست بێنێ بەجۆرێك کە لە ئاستە باڵاکانی بووندا ئەمە بە تەواوی ئەستەم دەبێ. ئەوە زانراوە کە ئەم خراپەیە ناوبەناو دەتووانێ دەستی باڵای هەبێ و لەلایەن خالقەوە رێگەی پێدراوە وەکو دەرەنجامێکی زەروری بەخشینی نیعمەتی ئیرادەی سەربەست بە مرۆڤی وەکو ئێمە.

تەنۆلکەکانی خراپە بە سەرانسەری گەردووندا بڵاو بوونەتەوە، بەڵام تێکڕای هەموو ئەو خراپەیە وەکو دەنکە لمێك بوو لەسەر کەناراوێکی گەورە گەر بەراورد بکرێت بەو چاکە، بەرەکەت، ئومێد و خۆشەویستییە بێمەرجەی تیایدا گەردوونی دەقاودەق داپۆشیبوو. لەوێ بونیادی رەهەندی جێگرەوە خۆشەویستی و قبوڵکردنە و هەر شتێك کە ئەم تایبەتمەندییانەی نییە ڕێك و ڕەوان و بەئاشکرا ناپەیوەندیدارە.

بەڵام ئیرادەی سەربەست لەسەر حسابی لەدەستدان یان دوورکەوتنەوە لەم خۆشەویستی و قبوڵکردنە دێت. ئێمە سەربەستین، بەڵام ئێمە ئەو بوونەوەرە سەربەستانەین کە بەهۆی ژینگەیەکەوە دەورە دراوین کە گەلەکۆمەکێ ئەکات بۆئەوەی وامان لێبکات هەست بکەین سەربەست نین. ئیرادەی سەربەست لە ئاستی زەمینیدا گرنگییەکی جەوهەری هەیە بۆ کردارمان: کردارێك کە، هەموومان رۆژێك لە رۆژان بۆمان دەردەکەوێ، رۆڵێکی زۆر گەورەتر لەوە دەبینێ کە رێگەمان بدات بەرەو رەهەندێ جێگرەوەی نازەمەنی سەرکەوین. لەوانەیە ژیانمان لێرە ناگرنگ دیار بێت، چونکە بە بەراورد بە ژیانەکانی تر و جیهانەکانی تر کە گەردوونە نادیار و دیارەکانیش دەگرێتەوە، چرکەساتێکە. بەڵام بەهەمان شێوە زۆر گرنگیشە، وچونکە رۆڵمان لێرە گەشەکردنە رووەو عەرشی ئیلاهی و ئەو گەشەیە لە نزیکەوە لەلایەن بوونەوەرەکانی جیهانەکانی سەرەوە چاودێری دەکرێت- گیانەکان و گۆیە شەفافەکان (ئەو بوونەوەرانەی کە لە بنەڕەتدا لە دەروازەکەی زۆر سەروو خۆمەوە بینیمن و پێم وایە بنچینەی تێگەیشتنی کەلتووریمانە بۆ فریشتەکان).

ئێمە- ئەو بوونەوەرە رۆحییانەی کە هەنوکە لە جەستە و مێشکە مرۆییە پەیتا پەیتا گەشەکردووەکانماندا نیشتەجێین، بەرهەمی زەوی و ئەزموونەکانی زەوین- بژارە (خیار)ی واقیعی هەڵدەبژێرین. بیرکردنەوەی راستەقینە ئیشی مێشك نییە.

بەڵکو ئێمە– بەشێکی بە کاریگەری مێشك خۆی– وا راهاتووین کە مێشکمان گرێ بدەینەوە بەوەی بیری لێدەکەینەوە و بەوەی کە کێین کە توانای ئەوەمان لەدەستداوە درك بەوە بکەین ئێمە هەموو کاتێ لەو مێشك و جەستە فیزیکییە زیاترین کە ملی بۆ کەچ دەکەین–یان پێویست بکات ملی بۆ کەچ بکەین.

بیرکردنەوەی راستەقینە پێش فیزیکیە. ئەمە بیرکردنەوەیە لە پشت ئەو بیرکردنەوەیەی کە بەرپرسە لە هەموو ئەو بژارە دەرەنجامە راستەقینانەی دەیانگرینە بەر. بیرکردنەوەیەك کە بەند نییە بە تێڕامانێکی راستەهێڵی، بەڵکو وەکو تیشك خێرایەن لە ئاستی جیاجیادا پەیوەندی دروست دەکات، پێکەوە کۆیان دەکاتەوە. لەبەرانبەر ئەم زیرەکییە ناوەکییە سەربەستەدا، بیرکردنەوەی ئاسایی ئێمە دەستەوستانانە خاو و خلیسکە. ئەمە بیرکردنەوەیەکە کە لە شوێنی گونجاوی خۆیدا تۆپ دەگرێتەوە، دەگاتە تێگەیشتنێکی زانستیی ئیلهامبەخش یان گۆرانییەکی ئیلهامبەخش دەنووسێتەوە. بیرکردنەوەیەکی سروش ئاسایە کە هەمیشە ئامادەیی هەیە، کاتێك بە راستی پێویستمان پێیەتی، بەڵام ئێمە هەموومان زۆربەی هەرە زۆری کات توانای ئەوەمان لەدەست داوە کە هەم پێی بکەین و هەم بڕوای پێ بێنین. گومانی تیا نییە کە، ئەمە بیرکردنەوەیەکە کە ئەو ئێوارەیەی کە پەڕەشوتەکەی (چوك) لەپڕ لەژێر منەوە کرایەوە، پراکتیزە بوو.

ئەزموونکردنی بیرکردنەوە لە دەرەوەی مێشکدا بریتییە لە چوونەناو جیهانێکی پەیوەندییە دەستبەجێکان کە بیرکردنەوەی ئاسایی (واتە ئەو لایەنانەی کە بە مێشکی جەستەیی و خێرایی رووناکی سنووردار کراون) لە چاویدا وەکو شتێکی خەواڵووانە و خاو دیارە. راستترین و قووڵترین خودمان بە تەواوی سەربەستە. بەهۆی کردارەکانی رابردووەوە کاری تێناکرێت یان پەك ناخرێت یان پەیوەندی نییە بە شوناس و پێگەوە. ئەوەت تێ دەگەیەنێ کە پێویستی بە ترسان لە جیهانی

زەمینی نییە و بۆیە، پێویستی بەوە نییە خۆی لەسەر ناوبانگ یان سامان یان داگیرکردن بونیاد بنێت.

ئەمە خودی رۆحیی راستەقینەیە کە هەموومان چارەنووسمان وایە رۆژێك لە رۆژان بەدەستی بهێنینەوە. بەڵام تا ئەو رۆژە دێت، هەست دەکەم دەبێ هەموو شتێك بکەین کە لە دەسەڵاتماندایە تا بکەوینە پەیوەندی لەگەڵ ئەم دیوە موعجیزەئاسایەی خۆمان– سۆراخی بکەین و بیهێنینەبەر رۆشنایی. ئەمە ئەو بوونەیە کە هەر ئێستا لەناو هەمووماندا دەژیت و لە راستیدا ئەو بوونەیە کە خودا بە راستی مەبەستیەتی لە ئێمە.

چۆن ئێمە نزیکتر دەبینەوە لە خودیّ رۆحیی راستەقینەمان؟ بە دەرخستنی خۆشەویستی و بەزەیی. بۆچی؟ چونکە خۆشەویستی و بەزەیی زۆر لەو ئەبستراکتبوون (تجرید)ە زیاترن کە زۆرێك لە ئێمە بۆی دەچین. ئەمانە راستەقینەن. کۆنکریتین. و بونیادی رووبەری رۆحی پێکدێنن.

بۆ گەڕانەوە بۆ ئەو رووبەرە، پێویستە ئێمە جارێکی تر وەکو (رووبەرەکە)مان لێبێت، ئەگەرچی لەبارێکدا بین کە لەناو ئەم رووبەرەدا گیرمان خواردبێت.

یەکێك لە گەورەترین ئەو هەڵانەی خەڵکی دەیکەن کاتێك بیر لە خودا دەکەنەوە، ئەوەیە کە خودا وەکو (ناکەس) وێنا دەکەن. بەڵیّ، خودا لە پشت ژمارەکانەوەیە، تەکامولی ئەو گەردوونەیە کە زانست پێوانەی دەکات و کۆشش دەکات تا لێی تیّ بگات. بەڵام– جارێکی تریش کە ناکۆکنامێزە– (ئۆم)یش "مرۆییە"– تەنانەت لە من و تۆش مرۆییترە. ئۆم لەوە قووڵتر و مرۆییتر کە ئێمە بتوانین وێنای بکەین لە بارودۆخی مرۆڤایەتیمان تێدەگات و هەستی پێدەکات، چونکە ئۆم دەزانێت چیمان بیر چووەتەوە و لەو قورساییە خەمناکەی ژین لەگەڵ لەبیرچوونەوەی عەرشی ئیلاهی تەنانەت بۆ ساتێکیش، تێدەگات.

بەشی شانزەهەم

# چاڵەکە

هۆڵی بۆ یەکەم جار لە ١٩٨٠کاندا (سیلڤیا)ی هاوڕێمانی ناسی، کاتێك هەردووکیان لە قوتابخانەی (راڤێنسکرۆفت) لە (راله)ی نۆرس کارۆلاینا وانەیان دەوتەوە.

کاتێك لەوێ بوو، هۆڵی-ش هاوڕێی نزیکی (سوزان رێینجتێس)یش بوو. سوزان پێشبینی بەهێزە- راستییەك کە قەت نەهاتووەتە ڕێی هەستەکانم لەبارەی ئەو. بە بۆچوونی من، ئەو کەسێکی زۆر تایبەت بوو، تەنانەت ئەگەرچی ئەوەی ئەو دەیگوت، لە دەرەوەی روانگەی راستگۆیانەی نەشتەرگەریی مێشك بوو. ئەو بەهەمان شێوە کەناڵێك بوو و کتێبێکی نووسراوی هەبوو بەناوی (کرانەوەی چاوی سێیەم) کە هۆڵی زۆر کەیفی پێدەهات. یەکێك لەو چالاکییە سارێژکردنەوە رۆحییانەی کە سوزان زووزوو جێبەجێی دەکرد یارمەتیدانی نەخۆشانی کۆما بوو کە لەرێگەی پەیوەندی لەگەڵ کردنیان بەشێوەیەکی جەستەیی چاك ببنەوە. رۆژی پێنجشەمە، واتە چوارەم رۆژم لە کۆمادا، سیلڤیا بیرۆکەی ئەوەی هەبوو کە دەبێ سوزان پەیوەندیم پێوە بکات.

سیلڤیا لە ماڵەوەی لە (چاپڵ هیڵ) تەلەفۆنی بۆ کرد و بۆی روونکردەوە کە چیم بەسەر هاتووە. ئایا ئاسان دەبێ بۆی کە "پەیوەندی"م پێوە بکات؟ سوزان وتی بەڵێ و داوای هەندێ وردەکاری کرد لەبارەی نەخۆشییەکەم. سیلڤیا بنچینەکانی پێدا: من لە ماوەی چوار رۆژە لە کۆمادام و لە بارودۆخێکی ناسکدام.

سوزان وتی "ئەمە هەموو ئەو شتەیە کە پێویستە بیزانم. هەوڵ دەدەم ئەمشەو پەیوەندی پێوە بکەم".

بەپێی تێڕوانینی سوزان، نەخۆشێکی کۆما جۆرێکە لە بوون لەنێواندا. نە بە تەواوی لێرە ( ئاستی زەمینی) و نە بە تەواوی لەوێ (ئاستی رۆحی) دەبێت، ئەم نەخۆشانە زۆرجار ئەم نەخۆشانە ئەتمۆسفیرێکی زۆر رازئامێزیان هەیە. ئەمە، هەروەکو وتم، دیاردەیەکە کە چەند جارێك خۆم تێبینیم کردووە، هەرچەندە من قەت ئەو ئیمتیازە سەرووسروشتییەم پێ نەبوو کە سوزان پێی دابوو.

لە ئەزموونی سوزاندا، یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی کە نەخۆشەکانی کۆمای جیا دەکردەوە، ئامادەیی وەرگرتنیان بوو بۆ پەیوەندیی تەلەپاتی (پەیوەندی راستەوخۆی هەستەکان و بیرکردنەوە). ئەو دڵنیا بوو لەوەی کە هەر کە خۆی بخستایەتە دۆخی رامانەوە، ئەوا بە زوویی پەیوەندی لەگەڵمدا بەرقەرار دەکرد.

ئەو دواتر پێی وتم "پەیوەندیکردن لەگەڵ نەخۆشێکی کۆما، کەمێك وەکو بەردانەوەی گوریسێکە بەناو چاڵێکی قووڵدا. ئەوەی کە گوریسەکە چەنێك قووڵ دەڕوات، پەیوەندی هەیە بە قووڵیی دۆخی کۆماکەوە. کاتێك هەوڵمدا پەیوەندیت پێوە بکەم، یەکەم شت کە سەری سوڕماندم ئەوە بوو کە گوریسەکە چەنێك قووڵ رۆیشت. چەندەی قووڵ رۆیشت، ئەوەندە زیاتر تۆقیم لەوەی کە تۆ یەکجار زۆر دووریت— ئەمەی کە ناتووانم پێت بگەم چونکە تۆ نایەیتەوە".

پاش پێنج خولەکی تەواوی چوونە خوارەوەی ئەقڵی بە "پەت"ی تەلەپاتیدا، ئەو هەستی بە وەرچەرخانێکی کەم کرد، وەکو قولاپێکی ماسیگرتن بۆ ناو قووڵایی ئاو کە جوڵەیەکی بچوک بەڵام دڵنیا بکات.

ئەو دواتر پێی وتم "دڵنیا بووم کە تۆیت و هەر ئەمەشم بە هۆڵی وت. پێم وت کە هێشتا کاتی تۆ نەهاتووە و جەستەت دەزانێ چی دەکات. بە هۆڵیم وت ئەو دوو بیرۆکەیە لە مێشك بگرێت و لای پێخەفەکەتەوە بۆتیان دووبارە بکاتەوە".

بەشی حەڤدەهەم

# ئێن—ی ١

ڕۆژی پێنجشەممە بوو کاتێك دکتۆرەکانم سوور بوون لەسەر ئەوەی کە جۆرە دیاریکراوەکەی ئی. کۆلای—ی من لەگەڵ ئەو جۆرە سەروو بەرەنگارە نەهاتووەتەوە کە، بەشێوەیەکی ڕوونەکراوە، لە ئیسرائیل دەرکەوتبوو ڕێك لەو کاتەشدا کە من لەوێ بووم. بەڵام ڕاستیی ئەوەی کە لەگەڵ یەکتریدا هاوجۆر نەبوون تەنیا کەیسەکەی منی قووڵتر کردەوە. لەکاتێکدا کە هەواڵێکی باش بوو کە من ئەو جۆرە بەکتریایەم هەڵنەگرتووە کە دەشێ یەك لەسەر سێی وڵات ڕامالێت، لە سۆنگەی چاکبوونەوەی کەسیی خۆمەوە، ئەمە تەنیا قورسایی بەخشییە ئەوەی کە دکتۆرەکان هەنوکە زۆر بە ڕوونی بۆی دەچوون: ئەمەی کە کەیسی من لە جەوهەردا پێشینەی نەبووە.

ئەمە بەهەمان شێوە بە خێرایی لە هەستی نائومێدییەوە بەرەو بێ هیوایی دەجوڵا. دکتۆرەکان وەڵامێکیان نەبوو بۆ ئەمەی کە ئەبێ چۆن تووشی ئەو نەخۆشییە بووبێتم، یان چۆن دەکرێ لە کۆماکەم بهێنرێمەوە دەر. ئەوان تەنیا لە یەك شت دڵنیا بوون: کەسیان شك نەدەبرد کە پاش زیاتر لە چەند ڕۆژێك کەوتنە

کۆما بە تەواوی لە حاڵەتی (مێنینجایتس)ی بەکتریایی چاك بووبێتنەوە. ئێکە ئێستا لە رۆژی چوارەمدا بووین.

نیگەرانی لە هەمووواندا بەرەو زیادی چوو. فیلیس و بێتسی رۆژی سێشەممە بڕیاری ئەوەیان دابوو کە قسەکردن لەبارەی ئەگەری مردنم لای من قەدەغەیە، لەژێر ئەو گریمانەیەدا کە لەوانەیە بەشێکی من لە قسەکردنەکە بەئاگا بێت. بەرەبەیانی پێنجشەممە، جین لەبارەی ئەگەرەکانی رزگاربوونم پرسیاری لە یەکێك لە پەرستارەکانی ژووری یەکەی چاودێریی ورد کردبوو. بێتسی، لەلایەکەی تری پێخەفەکەمەوە، گوێی لەو بوو و وتی: "تکایە ئەو وتوێژە لەم ژوورە ئەنجام مەدەن".

من و جین هەمیشە بێ ڕادە لە یەکترییەوە نزیك بووین. ئێمە بەشێك بووین لە خانەوادەکە وەکو خوشکە و برا "گەشەکردووەکانی ماڵ"مان، بەڵام راستیی ئەمەی کە ئێمە لەلایەن دایە و بابە "هەڵبژێردرابووین"، هەروەکو ئەوان دەیانوت، بەشێوەیەکی حەتمی پەیوەندییەکی تایبەتی پێمان بەخشیبوو. ئەو هەمیشە ئاگاداری من بوو و نائومێدیی لە بێ دەسەڵاتی بەرانبەر ئەو بارودۆخەم گەیاندبوویە ڕادەی تێکشکان.

فرمێسك رژانە چاوەکانی (جین). وتی "پێویستە بۆ ماوەیەك بڕۆمە ماڵەوە".

پاش دیاریکردنی ئەمەی کە خەڵکێکی زۆر هەیە شەونخونی لە پاڵ جێگاکەمەوە بکات، هەمووان رازیبوون لەسەر ئەوەی کە لەوانەیە ستافی پەرستاران دڵخۆش بن بەوەی کەسێك لە ژوورەکەم کەم بێتەوە.

جین گەڕایەوە بۆ ماڵی ئێمە، بارگە و بنەی لێك نا و ئەو پاش نیوەڕۆیە گەڕایەوە بۆ (دێلاوێر). بە رۆیشتنی، ئەو یەکەم گوزارشتی رواڵەتی بۆ حاڵەتێك دەربڕی کە

تەواوی خانەوادەکە پەیتا پەیتا هەستیان پێدەکرد: بێ دەسەڵاتی. ئەزموونی کەم هەن کە لە بینینی کەسێکی خۆشەویست لە کۆمادا نائومێدکەرتر بن. دەتەوێ یارمەتیدەر بیت بەڵام ناتوانیت. دەتەوێ کەسەکە چاوەکانی بکاتەوە، بەڵام نایکاتەوە. خانەوادەکانی نەخۆشەکانی کۆما زۆرجار خۆیان پەنا دەبەنەر بەر کردنەوەی چاوەکانی نەخۆشەکە. ئەمە شێوازێکی سەپاندنە– سەپاندنی فرمانێك بەسەر نەخۆشەکەدا کە بێدار بێتەوە. بێگومان ئەمە بێ ئەنجامە و دەشێ مەعنەویات وێرانتر بکات. ئەو نەخۆشانەی کە لە کۆمای قووڵدان هەماهەنگیی چاوەکان و گلێنەکانیان لەدەست دەدەن. پێلووی نەخۆشێکی کۆمای قووڵ هەڵبدەرەوە و لەوانەیە بۆت دەربکەوێت کە چاوێك بە ئاراستەی لایەك و چاوەکەی تر بە ئاراستەی لایەکی ترە. ئەمە دیمەنێکی ترسێنەرە و ئەو هەفتەیە چەند جارێك ئێش و ئازاری هۆڵی قووڵ کردەوە کاتێك پێلووی چاوەکانی کردمەوە و ، لە جەوهەردا، گۆی چاوی سوڕاوی لاشەیەکی بینی.

بە ڕۆیشتنی جین، شتەکان بە راستی بەرەو تێکچوون ڕۆیشتن. ئێستا فیلیس دەستیکرد بە پیشاندانی رەفتارێك کە خۆشم چەندەها جار لەناو ئەندامانی خانەوادەی نەخۆشەکان بینیومە لەماوەی ئیشکردنمدا لە نەخۆشخانە. ئەو دەستیکرد بە دەربڕینی بێزاری لەبەرانبەر دکتۆرەکان.

ئەو بە هەڵچوونییەوە پرسیاری لە بێتسی کرد "بۆچی زانیاریی زیاترمان پێنادەن؟ سوێند دەخۆم ئەگەر ئێبێن لێرە بووایە، بە راستی پێی دەوتین چ باسە".

راستییەکەی ئەوە بوو کە دکتۆرەکان بەشێوەیەکی رەها هەموو شتێکیان دەکرد کە لە توانایاندا بوو. بێگومان فیلیس دەیزانی. بەڵام ئێش و نائومێدیی بارودۆخەکە ئیتر کەسانی خۆشەویستمی دادەهێزراند.

رۆژی سێشەممە، هۆڵی تەلەفۆنی بۆ دکتۆر (جەی لۆفلەر) کردبوو کە هاوکاری پێشووم بوو لە پەرەپێدانی پرۆگرامی (ستێریۆتاکتیك رادیۆسێرجەری) لە نەخۆشخانەی (بریگام ئەند وەمن) لە بۆستن. جەی ئەو کاتە سەرۆکی بەشی (رادیەیشن ئەنکۆلۆجی) بوو لە نەخۆشخانەی گشتیی ماساشوسێتس و هۆڵی وای بۆچوو کە ئەو وەکو هەر کەسێکی تر لە پێگەیەکدایە کە دەتووانێ هەندێ وەڵامی بداتێ.

کاتێك هۆڵی باسی بارودۆخەکەی منی بۆ کرد، جەی پێی وابوو دەبێ ئەو وردەکاریی کەیسەکەی منی بە هەڵە بۆ باس کردبێت. ئەوەی کە هۆڵی بۆی باس کرد، بە بۆچوونی ئەو لە جەوهەردا مەحاڵ بوو. بەڵام کاتێك دواجار هۆڵی قەناعەتی بەو هێنا کە بە راستی من لە کۆمایەکدام کە بەهۆی کەیسێکی دەگمەنی ئی. کۆلای مێنێنجایتسی بەکتریایی دروست بووە کە کەس ناتووانێت سەرچاوەکەی روون بکاتەوە، دەستیکرد بە پەیوەندیکردن بە شارەزایانی بواری نەخۆشییەکانی پەتا لەسەرانسەری وڵاتدا. هیچ کام لەوانەی کە ئەو قسەی لەگەڵ کردبوون لەبارەی کەیسێکی وەکو ئەوەی منیان نەبیستبوو. بە گەڕانەوە بۆ ئەدەبیاتی پزیشکیی ١٩٩١، نەیتووانیبوو تاکە کەیسێکی مێنێنجایتسی ئی. کۆلای لە پێگەیشتوویەکدا بدۆزێتەوە کە بە تازەیی بە نەشتەگەریی دەماریدا تێنەپەڕیبێت.

لە رۆژی سێشەممە بەولاوە، جەی لانی کەم رۆژی جارێك تەلەفۆنی دەکرد بۆئەوەی هەواڵی تازەی لە فیلیس و هۆڵی دەست بکەوێت و زانیارییان پێبدات

لەبارەی سۆراخکردنەکانی. (ستیڤ تاتەر) کە نەشتەرگەرێکی مێشك و هاوڕێیەکی باش بوو، بەهەمان شێوە ڕۆژانە تەلەفۆنی دەکرد و ئامۆژگاری و ئاسودەیی پێیان دەبەخشی. بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، تاکە زانیاریی تازە ئەوە بوو کە حاڵەتی من یەکەمە لە جۆری خۆی لە مێژووی پزیشکیدا.

مێنێنجایتسی ئی. کۆلای ڕەمەکی لە پێگەیشتوواندا دەگمەنە. کەمتر لە یەك لە دە ملیۆنی دانیشتووانی جیهان ساڵانە تووشی دەبن. و وەکو هەموو جۆرەکانی مێنێنجایتسی بەکتریایی گرام نێگەتیڤ، زۆر بەرەنگارە. ئەوەندە بەرەنگارە کە لەو خەڵکانەی کە تووشی دەبن، زیاتر لە ٩٠٪ی ئەوانەی لە سەرەتاوە بەدەست دابەزینێکی دەماریی خێراوە دەناڵێنن، دەمرن. ئەمەش ئەو ئاستە تەندروستییە خراپە بوو کە من یەکەم جار داخڵی ژووری ئیمێرجێنسی کرام. ئەو ٩٠٪ە بەرەو ١٠٠٪ هەڵکشا کاتێك هەفتەکە تەواو بوو و جەستەم کاردانەوەی بۆ ئەنتی بایۆتیك نەبوو. ئەو ژمارە کەمەی کە لەو حاڵەتە توندەی وەکو من دەربازیان دەبێ بەشێوەیەکی گشتی پێویستیان بە بیست و چوار سەعات چاودێری هەیە لە تەواوی ژیانیاندا. بەشێوەیەکی رەسمی، دۆخی من "ئێن لە ١" بوو، زاراوەیەك کە ئاماژە بەو توێژینەوە پزیشکیانە دەکات کە تیایاندا تاکە نەخۆشێك لەژێر پشکنیندا دەمێنێتەوە. هیچ کەسێکی تر نەبوو کە دکتۆرەکان منی پێ بەراورد بکەن.

لە ڕۆژی چوارشەممەوە، هۆڵی هەموو پاش نیوەڕۆیەك دوای قوتابخانە بۆندی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا بۆ سەردان. بەڵام بەهاتنی ڕۆژی هەینی، ئەو پەیتاپەیتا لەوە ڕادەما ئاخۆ ئەم سەردانانە جگە لە ئازاری زیاتر هیچ باشەیەکیان هەیە. لە سەرەتای هەفتەکەدا، جارجارە دەجولام. جەستەم پەلەقاژەی دەکرد. پەرستارێك سەری دەشێلام و بەنجی زیاتری ئەدامێ و دواجار بۆ جارێکی هێمن دەبوومەوە.

بینینی ئەمە بۆ کورە تەمەن دە ساڵەکەم سەرگەردانکەر و ئازاربەخش بوو. ئەوەندە خراپ بوو کە ئەو دەیڕوانیە جەستەیەك کە چیتر باوکی نییە، بگرە بینینی جەستەیەك کە جوڵەی میکانیکی وەها دەکات کە بە هی منی نەدەزانین بەشێوەیەکی دیاریکراو پڕکێشە بوو. ڕۆژ دوای ڕۆژ، من زیاتر بوومە کەسێك کە ئەو دەیناسی و دەبوومە جەستەیەکی نەناسراوە لەناو جێگەدا: جمکێکی دڵڕەق و فەزایی ئەو باوکەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان دەیناسی.

بە هاتنی کۆتایی هەفتە، ئەم تەوژمە ناوبەناوەی جوڵەی مۆتۆرئاسا وەستابوون. پێویستم بە بەنجی زیاتر نەبوو، چونکە جوڵە- تەنانەت ئەو جۆرە ئۆتۆماتیکییە مردووەی کە بەشی خوارەوە ناوەندی مێشك و دڕکە پەتك دەیکەن- تەقریبەن ببووە سفر.

هاوڕێیان و ئەندامانی زیاتری خانەوادە تەلەفۆنیان دەکرد، پرسیاری ئەوەیان دەکرد ئاخۆ پێویست دەکات بێن. بەهاتنی پێنجشەممە، بڕیاری ئەوە درابوو کە نەیەن. ئیتر بایی پێویست زۆر جموجۆڵ لە ژووری یەکەی چاودێریم هەبوو. پەرستارەکان پێداگریی زۆریان کرد لەسەر ئەوەی کە مێشکم پێویستی بە پشووە- چەندەی ئارامتر بێ باشترە.

هەروەها گۆڕانێکی بەرچاو هەبوو لە تۆنی ئەم پەیوەندییە تەلەفۆنییانەدا. ئەوانیش بەرەبەرە لە ئومێدەوارەوە بۆ بێ ئومێد دەگۆڕان. جارجارە، بە ڕوانین لە دەوروبەر، هۆڵی هەستی دەکرد هەنوکە منی لەدەستداوە.

لە پاش نیوەڕۆی پێنجشەممەدا، مایکڵ سولیڤان لە دەرگای ماڵەکەی درا. سکرتێرەکەی بوو لە کەنیسەی (جۆن ئەپیسکۆپاڵ).

وتی "نەخۆشخانە لەسەر هێڵە. یەکێك لەو پەرستارانەی کە چاودێریی ئێبێن دەکات دەیەوێ قسەت لەگەڵ بکات. دەڵێ بەپەلەیە".

مایکڵ تەلەفۆنەکەی هەڵگرت.

پەرستارەکە پێی وت "مایکل، دەبێ هەر ئێستا بێیت. ئێبێن دەمرێت".

وەکو قەشەیەك، مایکڵ پێشتر لەو بارودۆخەدا بووە. قەشەکان تەقریبەن ئەوەندەی دکتۆرەکان مەرگ و ئەو تێکشکانەی لەدوای خۆی جێ دەهێڵێت دەبینن. لەگەڵ ئەوەشدا، مایکڵ بە بیستنی دەقی وشەی "دەمرێت"ی پەیوەندیدار بە من تووشی شۆك بوو. تەلەفۆنی بۆ (پەیج)ی هاوسەری کرد و داوای لێکرد نزا بکات: هەم بۆ من و هەم بۆ بەهێزبوونی بۆئەوەی بتوانێ هەستێت و بچێتە رێورەسمەکە. پاشان بەناو بارانێکی بەردەوامدا چووە نەخۆشخانە، لە کۆششدا بوو تا بەناو فرمێسکەکانیدا پێش خۆی ببینێت.

کاتێك گەیشتە ژوورەکەم دیمەنەکە وەکو ئەوەیان بوو کە لە دوایین سەردانیدا بینیبووی. فیلیس لە لامەوە دانیشتبوو، نۆرەی خۆی گرتبوو بۆ شەونخونیم و دەستمی گرتبوو و بێ پشوودان لە ساتەوەختی هاتنییەوە لە شەوی دووشەممەدا بەردەوام بوو. بە ماکینەی هەناسەدانەکە سنگم دوانزە جار هەڵدەستا و دەنیشتەوە و پەرستارەکە بە هێمنی بەدوای رۆتینیاتی خۆیدا وێڵ بوو، ئەو ئامێرانەی رێکدەخست کە دەوری پێخەفەکەمیان دابوو و تێبینی نووسراوەکانی سەر شاشەکانیان دەکرد.

پەرستارێکی تر هاتە ژوورەوە و مایکڵ پرسیاری ئەوەیکرد ئاخۆ ئەو بووە داوای یارمەتی لێکردووە. لە وەڵامدا وتی "نە. من تەواوی ئەو بەیانییە لێرە بووم و

لەشەوی رابردووەوە حاڵی ئەوەندە نەگۆڕاوە. نازانم کێ پەیوەندی پێتەوە کردووە".

بە هاتنی سەعات یانزە، هۆڵی، دایکم، فیلیس و بێتسی هەموویان لە ژوورەکەی من بوون. ملیکڵ داوای نزایەکی کرد. هەمووان، لەوانەش دوو پەرستارەکە، هاتنەپاڵ یەکتری و دەستیان لەناو دەستی یەکتری نا و مایکڵ نزایەکی تری لەناخەوە خوێند بۆ ئاساییبوونەوەی باری تەندروستیم.

"خودایە، ئێبێنمان بۆ بگەڕێنەرەوە. دەزانم لە دەسەڵاتی تۆدایە".

هێشتا، کەس نەیدەزانی کێ تەلەفۆنی بۆ مایکڵ کردووە. بەڵام هەرکەسێك بوویێت، شتێکی باشی کردووە. چونکە ئەو نزایانەی کە لە جیهانی ژێرەوە بۆم دەهاتن– ئەو جیهانەی کە لێیەوە دەستم پێکردبوو– دواجار شوێنی خۆیان دەگرت.

بەشی هەژدەیەم

# بیرچوونەوە و بیرهاتنەوە

ئێستا هۆشیارییم زیاتر بوو. ئەوەندە زۆر بوو کە پێدەچوو تەواوی گەردوون بگرێت. ئایا قەت لە ئێزگەیەکی پڕ تەشویشەوە گوێت لە گۆرانی گرتووە؟ لەگەڵیدا رادێیت. پاشان کەسێك دێت و سافی دەکات و هەمان گۆرانی بە روونییەکی تەواوەوە دەبیستیت. چۆن نەتتوانیووە تێبینی ئەوە بکەیت کە چەنێك لێڵ، چەنێك دوور، چەنێك ناراست بووە لەوەی پێشتر کە چۆن بوو؟

بێگومان، ئەقڵیش بەو شێوەیە ئیش دەکات. مرۆڤەکان بۆئەوە دروست بوون کە خۆیان بگونجێنن. من زۆرجار بۆ نەخۆشەکانم روون کردووەتەوە کە لەکاتێکدا جەستە و مێشکیان لەگەڵ بارودۆخە نوێکەدا خۆی گونجاند، ئەوا ئەو نائاسودەییە کەم دەبێتەوە یان لانی کەم پێدەچێ کەم بێتەوە. شتێك بایی پێویست درێژە دەکێشێت و مێشکت فێر دەبێ لەبیری بکات، یان ئیش لەسەر ئەوە بکات، یان تەنیا وەکو شتێکی ئاسایی مامەڵەی لەگەڵ بکات.

بەڵام ئاگایی زەمینیی سنووردارمان لە ئاساییبوون دوورە و من کاتێك قووڵتر بەرەو چەقەکە رۆیشتم، یەکەم روونبوونەوەم بۆ ئەم مەسەلەیە وەردەگرت. هێشتا

هیچم له رابردووی زەمینیم نەهاتبووەوە یاد، بەڵام هیچیش لەوە کەمتر نەبوو. هەرچەندە ژیانم لە خواری خوارەوە بیر چووبووەوە، دەمزانی کە لەوێ بە راستی و واقیعی کێم. من هاوڵاتییەکی گەردوونێك بووم کە سەری دەسوڕماند لە مەزنی و ئاڵۆزیدا و بە تەواوی لەلایەن خۆشەویستییەوە حوکم دەکرا.

تەقریبەن بە شێوازێکی سەیر، دۆزینەوەکانم لەودیو جەستەوە رەنگدەرەوەی وانەگەلێك بوون کە تەنیا پێش ساڵێك لە رێگەی یەکگرتنەوە لەگەڵ خانەوادەی بنچینەییمدا فێریان ببووم. سەرەنجام، کەس لە ئێمە هەتیو نییە. ئێمە هەموومان لەو پێگەیەداین کە منی تیابوو، لەوەدا کە ئێمە خانەوادەی ترمان هەیە: ئەو بوونەوەرانەی کە چاودێریمان دەکەن و ئاگایان لێمانە– ئەو بوونەوەرانەی کە بەشێوەیەکی کاتی بیرمان چوونەتەوە، بەڵام ئەگەر خۆمان بە رووی ئامادەییاندا واڵا بکەین، چاوەڕێن تا یارمەتیمان بدەن لێرە لەسەر زەوی سۆراخی زەمەنی خۆمان بکەین. هیچ کام لە ئێمە قەت خۆشنەویستراو نییە. هەریەك لە ئێمە بە قووڵی ناسراوە و بایەخێ پێدەدرێت لەلایەن خالقێکەوە کە لەسەروو هەموو توانایەکی تێگەیشتنمانەوە رێزمان دەگرێت. چیتر نابێ ئەم زانینە بە شاراوەیی بمێنێتەوە.

بەشی نۆزدەهەم

# نەتوانینی خۆشاردنەوە

بە هاتنی رۆژی هەینی، جەستەم بۆ ماوەی سێ رۆژی تەواو بوتڵێکی سێینەی ئەنتی بایۆتیکی بۆ هەڵواسرابوو، بەڵام هیچ کاردانەوەی نەبوو. خانەوادە و هاورێیان لە هەموو لایەکەوە هاتبوون و ئەوانەش کە نەهاتبوون لە کڵێساکانیاندا گروپی نزایان پێکهێنابوو. (پێگی)ی ژن خوشکم و سیلڤیای هاورێی نزیکی هۆڵی ئەو پاش نیوەڕۆیە گەیشتن. هۆڵی ئەوەندەی توانی بە رووپەکی خۆشەوە بەخێرهاتنی کردن. بێتسی و فیلیس بەردەوامبوون لە پێشەنگیی تێڕوانینی (ئەو باش دەبێ): بۆئەوەی هەرچۆنێك بێ هەر پۆزەتیڤ بن. بەڵام هەر رۆژە و بڕواکردن قورستر دەبوو. تەنانەت بێتسی خۆیشی دەستیکرد بە تێڕامان لەوەی ئاخۆ (نەبوونی نێگەتیڤبوون لە ژوورەکەدا) بە راستی بەمانای شتێکی لە بابەت (نەبوونی واقعیەت لە ژوورەکەدا) دێت.

ئەو بەیانییە فیلیس پاش شەوێکی تری بێ خەو پرسیاری لە بێتسی کرد "تۆ پێت وایە ئێبێن ئەو شتە بۆ ئێمە دەکات، ئەگەر رۆڵەکان دابەشکرابن؟ "

بێتسی پرسیاری کرد "مەبەستت چییە؟ "

"مەبەستم ئەوەیە خولەك لەدوای خولەك لەگەڵ ئێمە بەسەردەبات، ئەگەر لە دەرەوەی یەكەی چاودێرییەكە خێمەیەك هەڵدەین؟ "

بێتسی سادەترین و جوانترین وەڵامی دابووەوە، بەم پرسیارە: "ئایا شوێنێكی تر هەیە لەم جیهانەدا بتوانی وێنای چوونی بۆ بكەیت؟ "

هەردووكیان هاوڕابوون كە، هەرچەندە ئەگەر پێویستی بكردایە من لە یەك چركەدا لەویّ ئامادەییم هەبوو، زۆر زۆر قورس بوو وێنای ئەوە لە من بكەیت كە بۆ چەندەها سەعات بیّ كۆتایی لە شوێنێك دانیشم. فیلیس دواتر پێی وتم "ئەمە هیچ وەكو ئەركێك یان شتێك نەبوو كە دەبووایە بكرێت– ئەمە شوێنی ئێمە بوو".

ئەوەی كە بەزۆری سیلڤیای تووشی شڵەژان دەكرد دەست و پێیەكانم بوون كە پەیتا پەیتا زیاتر دەچەمانەوە، وەكو ئەو گەڵایانەی رووەكێك كە بیّ ئاوە. ئەمە بۆ قوربانیانی سەكتە و كۆما ئاساییە، چونكە ماسولكە زاڵەكانی پەلەكان دەست دەكەن بە هاتنەوەیەك. بەڵام قەت بۆ خانەوادە و كەسانی نزیك بینینی ئاسان نییە. بە روانین لە من، سیلڤیا بە بەردەوامی بەخۆی دەوت كە ئاسایی بێتەوە. بەڵام تەنانەت بۆ ئەویش قورس و قورستر دەبوو.

هۆڵی زیاتر و زیاتر سەرزەنشتی خۆی دەكرد (ئەگەر تەنیا كەمێك زووتر سەر قادرمەكان بكەوتایە، تەنیا ئەوەندە، تەنیا و تەنیا ئەوە) و هەمووان لە كۆششی ئەوەدابوون كە لە بابەتەكە دایببڕن.

ئێستا ئیتر هەمووان دەیانزانی كە ئەگەر چاكیش ببمەوە، ئەو چاكبوونەوە مانای خۆی نەدەگەیاند. پێویستم بە سیّ مانگی بوژانەوەی چڕوپڕ دەبوو، كێشە درێژخایەنی قسەكردنم دەبوو (ئەگەر ئەوەندە توانای مێشكم هەبیّ كە بتوانم تەنانەت قسەش بكەم) و بە درێژایی ژیانم پێویستم بە چاودێریی پەرستاریی

بەردەوام دەبوو. ئەمە باشترین سیناریۆی کەیسەکە بوو و چەندەی ناخۆش و تۆقێنەریش دیارە، تەنیا لە خەیاڵدا بوو. تەنانەت ئەگەری ئەمەی کە لە حاڵێکی باشدا بم، بەرە بەرە نەدەما.

بۆند لە گوێبیستبوون لە وردەکاریی تەواوی حاڵەتەکەم دوور خرابووەوە. بەڵام رۆژی هەینی لە نەخۆشخانە پاش ئەوەی قوتابخانەی تەواو ببوو، گوێ لە یەکێك لە دکتۆرەکان بوو ئەوەی بۆ هۆڵی باس دەکرد کە تاوەکو ئەو ساتە دەیزانی.

کاتی رووبەڕووبوونەوەی راستییەکان هاتبوو. ئومێدێکی کەم بۆ هیوا هەبوو.

ئەو ئێوارەیە، کاتێك وەختی چوونەوەماڵەوە هاتبوو، بۆند رەتی کردبووەوە ژوورەکەم جێ بهێڵێت. رۆتینەکە بە جۆرێك بوو کە لەیەك کاتدا تەنیا رێگە بە دوو کەس بدرێ بێنە ژوورەکەمەوە بۆئەوەی دکتۆرەکان و پەرستارەکان بتوانن ئیش بکەن. دەوروبەری سەعات شەش، بە هێمنی پێشنیاری چوونەوە بۆ ماڵەوەی کرد بۆ ئێوارە. بەڵام بۆند لەسەر کورسییەکەی هەڵنەدەستا.

بۆند بە دەنگێکی نیوە نابەدڵ و نیوە پاڕانەوە وتی "خۆ ئەو هەر نازانێ من لێرەم. ئەی بۆچی نەمێنمەوە؟ "

بۆیە لە تەواوی ئەو ئێوارەیەدا هەمووان نۆرەکەیان بەشێوەی یەك کەس لە یەك کاتدا جێبەجێکرد بۆئەوەی بۆند بتوانێ بمێنێتەوە.

بەڵام بەیانیی دواتر- شەممە- لە شوێنی خۆی نەجولا. بۆ یەکەمین جار لەو هەفتەیەدا، کاتێك هۆڵی خۆ بە ژوورەکەیدا کرد بۆئەوەی هەڵیستێنێت، ئەو نەیویست بچێتە نەخۆشخانە.

هۆڵی پرسیاری کرد "بۆچی نا؟ "

بۆند وتی "چونکە دەترسم"

ئەمە دانپیانانێك بوو کە زمانحاڵی هەموویان دەریدەبڕی.

هۆڵی بۆ چەند خولەکێك چووە خوارەوە بۆ مەتبەخ. پاشان جارێکی تر هەوڵیدا و پرسیاری کرد ئاخۆ دڵنیایە کە نایەویٚ باوکە ببینێت.

کاتێك بۆند چاوەکانی بڕییە ئەو هەڵوەستەیەکی درێژ لەئارادابوو.

دواجار رازی بوو "باشە".

شەممە بە شەونخونییەکی بەردەوام لەدەوری پێخەفەکەم و وتوێژی ئومێدەوارانەی نێوان خانەوادە و دکتۆرەکان تێپەڕی. هەمووی لە تەقەلایەکی نائومێدانە دەچوو بۆ هێشتنەوەی هیوا. ئومێدی هەر یەك لەوان کەمتر بوو بە بەراورد بە رۆژی پێشوو.

لە شەوی شەممەدا، پاش بردنەوەی دایکمان، بێتی، بۆ ژووری خۆی لە هۆتێلەکەدا، فیلیس لای ماڵەکەمانەوە وەستا. تاریکێکی ئەنگوستەچاو بوو، رووناکی لە هیچ کام لە پەنجەرەکانەوە دیار نەبوو و لەکاتێکدا کە بەناو قوڕەکە دەردەچوو سەخت بوو بۆی کە لەسەر کاشییە بەردینەکان بمێنێتەوە. تاوەکو ئەو کاتە پێنج رۆژ بوو باران دەباری، هەر لەو کاتەوە کە داخڵی ژووری یەکەی چاودێریی ورد کرابووم. بارانی بێ وچانی وەها سەبارەت بە بەرزاییەکانی ڤێرجینیا زۆر نائاسایی بوو، کە تیایدا لە مانگی تشرینی دووەمدا بەزۆری وشك، روون و ساماڵە، وەکو یەکشەممەی پێشوو، دوایین رۆژی پێش نەوبەکەم. ئێستا ئیتر ئەو رۆژە دوور دیار بوو و هەستت دەکرد ئاسمان هەمیشە هەر باراناوی بووە. ئاخیری کەی دوەستیٚ؟

فیلیس دەرگاکانی کردەوە و گڵۆپەکانی هەڵکرد. هەر لە دەستپێکی هەفتەکەوە، خەڵکی دەهاتن و خواردنیان دەهێنا و هەرچەندە هێشتا خۆراك دەهات، فەزای

نیوە ئومێدەوار و نیوە نیگەرانی خەڵکەکە بۆ ئیمێرجێنسییەکی کاتی تاریکتر و ساردوسڕتر ببوو. هاوڕێیانمان، وەکو خانەوادەکەمان، دەیزانی کە کاتی هەر هیوایەك بۆم لە کۆتایی نزیك دەبێتەوە.

بۆ چرکەساتێك، فیلیس بیری لە داگیرساندنی ئاگرێك کردەوە، بەڵام رێك لەو بیرۆکەیەوە دانەیەکی تر هات، ئەمەیان نێگەتیڤ بوو. بۆچی؟ ئەو لەپڕ زیاتر لە هەر کاتێکی تر هەستی بە داهێزران و خەم کرد. لەسەر قەنەفەکەی ژووری خوێندنەوە پاڵ کەوت و کەوتە خەوێکی قووڵەوە.

نیوسەعاتێك دواتر، سیلڤیا و پێگی گەڕانەوە، بەلای ژووری خوێندنەوەدا هەنگاویان دەنا کاتێك بینیان فیلیس لەوێ پاڵ کەوتووە. سیلڤیا چووە خوارەوە بۆ ژێرزەمینەکە و بینی کەسێك دەرگای فریزەرەکەی بە ئاوەڵایی جێهێشتووە. ئاو گۆماوێکی لەسەر زەوییەکە دروست کردبوو و خواردەمەنی لە تووانەوەدا بوو، لەوانەش چەند پارچە گۆشتێکی جوان.

کاتێك سیلڤیا هەواڵی بارودۆخی ژێرزەمینەکەی بە پێگی گەیاند، بڕیاریاندا سوودی لێوەرگرن. ئەوان تەلەفۆنیان بۆ بەشەکەی تر خانەوادە و چەند هاوڕێیەك کرد و کەوتنە ئیش. پێگی چووە دەرەوە و هەندێ موقەبیلات و زەڵاتەی زیاتری دەست دایە و میوانداریيەکی ڕەمەکیيان سازدا. بەزوویی بێتسی، کەتی-ی کچی و مێردەکەی، رۆبی، هاتنە لایان لەگەڵ بۆند. دەمەتەقێیەکی پڕنیگەرانی و ڕاڕاییەکی زۆر لەسەر مەسەلەکە لە مێشکی هەمووان‌دا لەئارادابوو: لەبارەی ئەمەی کە من- میوانی شەرەڤ نادیار- بە ئەگەرێکی زۆر قەت جارێکی تر ناگەڕێمەوە ناو ئەم ماڵە.

هۆڵی گەڕابووەوە بۆ نەخۆشخانە بۆئەوەی لەسەر شەونخونییە بێ کۆتاییەکە بەردەوام بێت. لە تەك پێخەفەکەمەوە دانیشت، دەستی هەڵگرتم و دەستیکرد بە دووبارەکردنەوەی ئەو رستانەی سوزان رێینتجێس وتبووی بیانڵێت، زۆری لە خۆی دەکرد تا لەگەڵ مانای وشەکاندا بمێنێتەوە لەکاتێکدا کە دەیگووتن و بڕوا بە دڵی بێنێت کە راستن.

"نزاکان وەرگرە.

"تۆ ئەوانیترت چاك کردووەتەوە. ئێستا کاتی ئەوەیە تۆ چاك بیتەوە.

"تۆ زۆرێك خۆشیان دەوێیت.

"جەستەت دەزانێ چی بکات. ئێستا کاتی ئەوە نییە بمریت".

بەشی بیستەم

# کۆتاییەکە

هەر کاتێك کە خۆم دەبینییەوە لە روانگەی چاوی کرمدا دەبینییەوە، دەمتووانی ئاوازی غەزەلە جوانەکەم بێتەوە یاد کە دەرگای بەرووی دەروازەکە و چەقەکەدا دەکردەوە. ماوە کاتی درێژم بەسەر بردن- کە بە شێوەیەکی ناکۆکئامێز بەهیچ شێوەیەك هەستم بە بوونی کات نەکرد- بە ئامادەبوونی فریشتەی پاسەوانم لەسەر باڵی پەپولە و وانەی فێربوون لەبارەی ئەبەدیەت لە خالق و گۆیە رووناکییەکە لە چەقەکەدا.

لە ساتێك لە ساتەکاندا، سەرکەوتم بۆ سەر لێواری دەروازەکە و بۆم دەرکەوت کە ناتووانم بچمەوە ناوی. ئاوازی غەزەلەکە- کە تا ئەو ساتە تیکتی من بوو بۆ ناو ئەو رووبەرە بەرزانە- چیتر بۆ ئەوێی نەدەبردم. دەروازەکانی بەهەشت داخرابوون.

جارێکی تر، وەسفکردنی ئەوەی کە چ هەستێك دەبەخشێ زۆر سەختە، ئەمەش لە سایەی تەنگژەی زمانی راستەهێڵی کە دەبێ ئێمە لێرە هەموو شتێکی پێ هەڵرێژین و رێکی ئەزموون کە کاتێك لەناو جەستەداین روودەدات. بیر هەموو ئەو ساتانە بکەرەوە کە تۆ نائومێدیت ئەزموون کردووە. هەستێك هەیە کە تیایدا

هەموو ئەو لەدەستدانانەی لێرە لەسەر زەوی تووشیان دەبین لە راستیدا داتاشراوەی یەك لەدەستدانی جەوهەریی رەهان: لەدەستدانی بەهەشت. لەو رۆژەدا کە دەرگاکانی بەهەشت لە من داخرابوون، هەستم بە خەمبارییەکی جیاواز کرد. هەستەکان لەوێ جیاوازن. هەموو هەستە مرۆییەکان ئامادەییان هەیە، بەڵام قووڵتر و بەرفراوانترن– تەنیا لە ناوەوە نین، بەڵکو لە دەرەوەشن.

وێنای ئەوە بکە کە هەر جارێك لەسەر زەوی میزاجت گۆڕاوە، دەستبەجێ کەش و هەواش لەگەڵیدا گۆڕاوە. فرمێسکەکانت بە لێشاو دێنەخوار و شادیت دەستبەجێ هەورەکان پەرت دەکات.

ئەمە ئاماژەیەك لەوە دەدات کە گۆڕانە گەورە و کاریگەرەکانی میزاج لەوێ چ هەستێك دەبەخشن، چەنێك بەشێوەیەکی سەیر و کاریگەر ئەوەی کە بە "ناوەوە" و "دەرەوە" بیر لێدەکەینەوە لە راستیدا بەهیچ شێوەیەك بوونی نییە.

بۆیە ئەوە من بووم، بە دڵشکاوی، کە ئێستا نغرۆی جیهانێکی پەیتا پەیتا پڕ لە خەم بوو، خەمێك کە لە هەمان کاتدا نغرۆبوونێکی راستەقینەش بوو.

لە رێگەی دیوارە گەورەکانی هەورەوە بەرەو خوارەوە رۆیشتم. لە دەوروبەرمەوە دەنگەدەنگ دەهات بەڵام نەمدەتوانی لە وشەکان تێبگەم. دواتر تێگەیشتم کە ژمارەیەکی یەکجار زۆری بوونەوەر دەوریان داوم، لە شێوەیەکی قەوسدا ئەژنۆیان دادابوو کە ئەوسەریان دیار نەبوو. ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە، تێدەگەم کە ئەو هەرەمە لە بوونەوەرانە کە نیوە بینراو و نیوە هەستپێکراو بوون و بەناو تاریکاییدا لە خوارەوە و سەرەوە بڵاو ببوونەوە، چیان دەکرد.

نزایان بۆ دەکردم.

دوو لەو روخسارانەی کە دواتر هاتنەوە یادم هی مایکڵ سولیڤان و هاوسەرەکەی بوون. دێتەوە یادم کە تەنیا لایەکیانم دەبینی، بەڵام بە روونی ناسیمنەوە کاتێك زمان هاتەوەگەڕ. مایکڵ بە جەستە لە ژووری یەکەی چاودێری بووە و چەندەها جار نزای کردووە، بەڵام پەیجی خێزانی قەت بە جەستە لەوێ نەبووە (هەرچەندە ئەویش نزای بۆ کردبووم).

نزاکان وزەیان پێ بەخشیم. لەوانەیە هەر لەبەرئەوەش بێت کە لەکاتێکدا لە ناخەوە خەمبار بووم، شتێك لە مندا هەستی ئاسودەییەکی سەیری بەخشی، لەمەڕ ئەوەی کە هەموو شتێ لە باشیدا دەبێ. ئەو بوونەوەرانە دەیانزانی من لە دۆخێکی گواستنەوەدام و ئەوان گۆرانیان دەوت و نزایان دەکر بۆئەوەی یارمەتیم بدەن مەعنەویاتم بەرز بێت. من کەوتبوومە ناو نادیارییەوە، بەڵام ئیتر تا ئەو ساتەدا باوەڕ و متمانەیەکی تەواوم هەبوو بەوەی کە دەپارێزرێم، هەروەکو هاوەڵەکەم لەسەر باڵی پەپولە و خوداوەندی بێ ڕادە بەسۆز بەڵێنیان دابوو- کە بۆ هەر کوێیەك بڕۆم، ئاسمان لەگەڵما دێت. لە شێوەی خالق، لە شێوەی ئۆم و لە شێوەی فریشتەدا دێت- فریشتەی من- ئەو کچەی لەسەر باڵی پەپولە بوو.

من لە رێگەی گەڕانەوەدا بووم، بەڵام تەنیا نەبووم- و زانیم کە قەت جارێکی تر تەنیا نابمەوە.

بەشی بیست و یەك

# پەلکەزێڕینە

کاتێك دواتر بیرم لێدەکردەوە، فیلیس وتی یەك شت کە لە هەموو شتێك زیاتر لەبیری بووە لەو هەفتەیەدا، باران بووە. بارانێکی ساردی بەردەوام لە هەورە نزمەکانەوە کە قەت خاو نەبووەوە و قەت نەیهێشت خۆر دەرکەوێت. بەڵام ئەو کاتە، ئەو سەر لەبەیانی یەکشەممەیە کاتێك ئۆتۆمبیلەکەی لە گەراجی نەخۆشخانەکە دانا، شتێکی سەیر روویدا. فیلیس تازە مێسجێکی یەکێك لە گروپەکانی نزا لە بۆستن خوێندبووەوە کە تیایدا هاتبوو، "چاوەڕێی موعجیزەیەك بکە". لەکاتێکدا کە لەوە ڕاما بوو کە دەبێ تا چ برێك چاوەڕێی موعجیزەکە بکات، یارمەتی دایکمی دا تا لە ئۆتۆمبێلەکەی بێتە خوارەوە و هەردووکیان وتیان باران وەستابوو. لەلای خۆرهەڵاتەوە، خۆر لە دەلاقەیەکی رووپۆشێکی هەورەوە تیشکەکانی ئاراستە دەکرد، شاخە دلگیرە کۆنەکانی لای خۆرئاوا و توێژاڵێك لە هەورەکانیشی رووناك دەکردەوە، پەڵەیەکی زێڕینی بە هەورە خۆڵەمێشییەکان دەدا. پاشان، بە روانین لە لوتکە دوورەکان، بەرانبەر ئەو شوێنەی کە خۆری ناوەڕاستی تشرینی یەکەم هەڵاتنی دەستپێدەکرد، لەوێ شتێك هەبوو.

پەلکەزێڕینەیەکی تەواوەتی.

سیلڤیا لەگەڵ هۆڵی و بۆند بۆ لەپێشدا ڕێکخستنی کۆبوونەوەیەك لەگەڵ دکتۆرە سەرەکییەکەم (سکۆت وەید) بەرەو نەخۆشخانە کەوتنەڕێ. دکتۆر وەید-یش هاوڕێ و دراوسێ بوو و لە ململانێدا بوو لەگەڵ خراپترین بڕیار کە دکتۆرەکان دەست و پەنجەیان لەگەڵ پڕهەڕەشەترین نەخۆشیدا نەرم دەکرد. چەندەی زیاتر لە کۆمادا بمایەتمەوە، ئەوەندە ئەگەری زیاتر دەبوو کە بەشەکەی تری ژیانم لە "دۆخێکی ڕووەك ئاسا"دا بەسەر ببەم. بە لەبەرچاوگرتنی ئەگەری زۆری ئەمەی کە لەوانەیە من هێشتا شکست بێنم لەبەرانبەر مێنینجایتس-دا ئەگەر ئەوان هەروا بە سانایی ئەنتی بایۆتیکیان وەستاند، ئەوا لەوانەیە وەستاندنی بەکارهێنانی مەعقولتر بێت- نەك ئەوەی چارەسەر لە بەرانبەر کۆمایەکی تەقریبەن تاهەتاییدا درێژە پێ بدەیت. بە لەبەرچاوگرتنی ئەمەی کە مێنینجایتسی من لەو هەموو چارەسەرە باشەدا کاردانەوەی نەبوو، ئەوان لە بەردەم مەترسی ئەوەدا بوون کە لەوانەیە دواجار مێنینجایتسی من ریشەکێش بکەن بەڵام وەکو جەستەیەکی بێ جوڵە و بێ تایبەتمەندیی ژیان کە تا چەند مانگ یان ساڵێك بەردەوام دەبێت، توانای ژیانم پێ بدەنەوە.

دکتۆر وەید بە دەنگێکی بەڕێز بەڵام خەمبارەوە بە سیلڤیا و هۆڵی وت "فەرموون دانیشن".

"من و دکتۆر برێنان هەردووکمان پەیوەندیی تەلەفۆنی کۆنفرانسمان لەگەڵ شارەزایانی (دیوك)، زانکۆی "ڤیرجینیا" سکوڵە پزیشکییەکانی (بۆومان گرەی) ئەنجامدا و هەمووان یەك بە یەك لەسەر ئەو بڕوایەن کە شتەکان لە باشیدا نین. ئەگەر نێبێن لە ماوەی دوانزە سەعات دواییدا باشبوونێکی واقیعی بەخۆیەوە نەبینێت، ئەوا لەوانەیە قسە پێشنیاری قسەکردن بکەین لەسەر کۆتاییهێنان بە ئەنتی بایۆتیك. هەفتەیەك لە کۆمادابوون بە مێنێنجایتسی بەکتریایی توندەوە

هەنوکە لەسەروو سنوورەکانی هەر پێشبینییەکی مەعقولە بۆ چاکبوونەوە. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو ئەگەرانە، لەوانەیە وا باشتر بێت لێگەڕێین سروشت کاری خۆی بکات".

هۆلی بە نارەزاییەوە وتی "بەلام، دوێنێ بینیم کە پێلووەکانی چاوی دەجولێن. بە راستی جولان. تەقریبەن وەك بلێی دەیەوێ بیانکاتەوە. دلنیام لەوەی کە بینیم".

دکتۆر وەید وتی "گومانی نییە کە بینیووتە. رێژەی خڕۆکەکانی خوێنیشی دابەزیووە. ئەمە نیشانەی باشە و قەت نالێم وانییە. بەلام دەبێ بارودۆخەکە وەك خۆی ببینن. ئێمە بەنجەکەی ئێبێنمان بەشێوەیەکی بەرچاو کەم کردووەتەوە و دەبێ تاوەکو ئەم ساتە پشکنینە دەمارییەکەی چالاکیی دەماریی زیاتر پیشان بدات لەوەی کە هەیە. بەشی خوارەوەی مێشکی بەشێوەیەکی رێژەیی ئیش دەکات، بەلام ئێمە کرداری ئاستی سەرەوەمان دەوێت و ئەمەیان بە تەواوی بزرە. رادەیەکی دیاریکراوی باشبوون لە چالاکیی رواڵەتی لە زۆربەی نەخۆشەکانی کۆمادا پێ بەپێی کات روودەدات. جەستەکانیان هەندێ شت دەکەن کە دەشێ واپیشانی بدات کە لە گەڕانەوەدان. بەلام راستییەکەی وانییە. ئەوە تەنیا بەشی خوارەوەی مێشکە دەکەوێتە دۆخێکەوە کە پێی دەوترێت (کۆما ڤیجیل)، جۆرێکە لە بنەمایەکی هێشتنەوە کە دەشێ بۆ چەند مانگ و ساڵ تیایدا بمێننەوە. جولەی پێلووەکانیش بە ئەگەرێکی زۆر هەر ئەمەیە. دەبێ جارێکی تریش پێتان بلێم کە حەوت رۆژ بۆ مێنێنجایتسی بەکتریایی بە راستی کاتێکی زۆرە لە کۆمادا".

دکتۆر وەید وشەی زۆری بەکاردەهێنان لە هەولدا بۆ نەرمکردنەوەی هەواڵێك کە دەکرا تەنیا لە رستەیەکدا دەرببڕدرێت.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لێگەڕێن جەستەی من بمرێ.

بەشی بیست و دوو

# شەش روخسار

لەکاتێکدا کە دابەزیم، روخساری زیاتر لە قوڕەکە دەرکەوتن، هەروەکو ئەو کاتەی کە دادەبەزیمە ناوچەی روانگەی چاوی کرم. بەڵام ئەمجارەیان روخسارەکان جیاواز بون. ئێستا ئیتر مرۆڤ بوون نەك ئاژەڵ. وە بە روونیش شتیان دەوت.

نەمدەتووانی بزانم چی دەڵێن. دواتر کە دەهاتەوە یادم، زانیم کە بە راستی لەوەی کە بینیم شەش روخسار بناسمەوە. سیلڤیا، هۆڵی و پێگی خوشکی لەوێ بوون. سکۆت وەید لەوێ و هەروەها سوزان رێینتجێس لەوێ بوو. لەمانە، تاکە کەسێك کە بە واقیعی لەو چەند سەعاتەی دواتردا لەوێ نەبوو سوزان بوو. بەڵام بێگومان ئەویش بە شێوازی خۆی لە تەکمەوە بووە، چونکە ئەو شەوە کە شەوی پێشتر بوو، لە ماڵی خۆی لە چاپڵ هیلێ دانیشتبوو و بە پەیوەندیی زیهنی لام ئامادە بووە.

دواتر، بە زانین لەبارەی ئەمەوە، تووشی سەرسوڕمان بووم کە دایکم بێتی و خوشکەکانم، کە تەواوی هەفتەکە لەوێ بوون و بە سۆزەوە بۆ چەندەها سەعات دەستیان گرتبووم لەو ریزە روخسارانەدا نەبوون کە بینیبوومن. دایکم بە دەست ئازاری شکانێکەوە لە پێیدا دەینالاند پێویستی بە کەسێك بوو دەستی لە مل بکات

بۆئەوەی بە ڕێگەدا بڕوات بەڵام بەوپەڕی وەفاوە نۆرەی خۆی بینیبوو لە شەونخونیدا. فیلیس، بێتسی و جین هەموویان لەوێ ببوون. پاشان زانیم کە ئەو دوایین شەوە لەوێ نەبوون. ئەو ڕوخسارانەی کە هاتنەوە یادم ئەوانە بوون کەحەوتەم بەیانیی کۆماکەم یان ئێوارەی پێشتر بە جەستە لەوێ بوون.

هەرچەندە، جارێکی تر، لەو کاتەدا کە دادەبەزیم، هیچ ناوێك یان شوناسێك نەبوو بیخەمە پاڵ ئەو ڕوخسارانە. تەنیا دەمزانی یان هەستم دەکرد ئەوانە بەجۆرێك لە جۆرەکان گرنگن بۆم.

یەکێکیان زیاتر لەوانەیتر بە هێزە تایبەتەکەی بەرەو خۆی ڕایکێشام، توند ڕایکێشام. بە تەوژمێك کە پێدەچوو بەناو چاڵێك لە هەورە گەورەکان و بوونەوەرە فریشتەئاساکانەوە بەلای سەرەوە و خوارەوەدا تیشك بداتەوە کە من پیایدا دادەبەزیم. لەپڕ درکم بەوە کرد کە بوونەوەرەکانی دەروازەکە و چەقەکە- ئەو بوونەوەرانەی کە ناسیبوومن و خۆشم دەویستن، تاهەتایە- بە تەنیا هەر ئەوان نەبوون کە دەمناسین. بوونەوەری تریش هەبوون لە خوارەوە کە دەمناسین و خۆشم دەویستن ( لە خواری خوارەوە بە خێرایی نزیك دەبوومەوە) ئەو بوونەوەرانەی کە تاوەکو ئێستا بە تەواوی لەبیر چووبوونەوە.

ئەم زانینە تەرکیزی کردبووە سەر هەر شەش ڕوخسارەکان، بەڵام بەتایبەت شەشەمیان. ئەمەیان زۆر ئاشنا بوو. بە هەستێکی شۆکئامێزی پڕ ترسەوە درکم بەوە کرد کە هەر کەسێك بێت، ڕوخساری یەکێکە کە پێویستی پێمە. کەسێك کە ئەگەر بمردمایە قەت چاك نەدەبووەوە. ئەگەر دەستبەرداری بوومایە، ئەوا لەدەستچوونەکە تەحەمولنەکراو دەبوو- وەکو هەستەی کە هەمبوو کاتێك

دەروازەکانی رووەو بەهەشت داخرابوون. ئەمە خیانەتێك دەبوو کە نەمدەتووانی ئەنجامی بدەم.

تاوەکو ئەو ساتە، من سەربەست بووم. سەرکێشترین گەشتم بە جیهانگەلێکدا ئەنجامدابوو: بەبێ خەمخواردن بە ئاکامەکەیەوە. سەرەنجامەکە گرنگ نەبوو، چونکە تەنانەت ئەو کاتەش کە لە چەقەکەدا بووم، قەت هیچ نیگەرانی یان تاوانێك نەبوو لەمەڕ پشتکردنە کەسێك. بێگومان ئەمە یەکەم شت بوو کە فێری ببووم کاتێك لەگەڵ کچەکە لەسەر باڵی پەپولە بووم و پێی وتم: "هیچ شتێك نییە کە هەڵەی تیا بکەیت".

بەڵام ئێستا ئیتر جیاواز بوو. ئەوەندە جیاواز کە، بۆ یەکەمین جار لە تەواوی گەشتەکەمدا، هەستم بە تۆقینێکی بەرچاو کرد. تۆقینێك نەك بۆ خۆم بەڵکو بۆ ئەم روخسارانە– بەتایبەت بۆ ئەو شەشەم روخسارە. روخسارێك کە هێشتا نەمدەتووانی بیناسمەوە بەڵام دەمزانی یەکجار گرنگە بۆم.

روخسارەکە وردەکاری زیاتر و زیاتری دەگرتەخۆی تائەوەی کە دواجار بینیم کە لە راستیدا تکای لێدەکردم بگەڕێمەوە: سەرکێشیی خەمناکی دابەزین بۆ جیهانی خوارەوە، ئەوە بوو کە جارێکی تر لەگەڵێدابم. هێشتا نەمدەتووانی لە وشەکانی تێبگەم، بەڵام بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەوان مانای ئەوەیان گەیاند کە من پشکم لەم جیهانەی خوارەوەدا هەیە.

گەڕانەوەم بایەخی هەبوو. لێرە پەیوەندیم هەبوو– ئەو پەیوەندییانەی کە دەبووایە رێزیان لێبنێم. چەندەی روخسارەکە روونتر بووەوە، ئەوەندەش زیاتر درکم بەوە کرد. ئەوەندەش زیاتر روخسارەکەم دەناسییەوە.

روخساری منداڵکارێك.

بەشی بیست و سێیەم

## شەوی کۆتایی، یەکەم بەیانی

پێش دانیشتن لەگەڵ دکتۆر وەید، هۆڵی بە بۆندی وت لە دەرەوەی دەرگاکە چاوەڕێ بکات چونکە نەیدەویست ئەو شتە ببیستێت کە خۆی زانیبووی هەواڵێکی خراپە. بەڵام بە هەستکردن بەمە، بۆند لە دەرەوەی دەرگاکە چاوەڕوان ببوو و هەندێ لە وشەکانی دکتۆر وەیدی بیستبووەوە. ئەم وشانە بەس بوون بۆئەوەی لە بارودۆخە واقعییەکە تێبگات. تێگەیشتنی ئەوەی کە باوکی لە راستیدا قەت ناگەڕێتەوە.

بۆند رایکردە ناو ژوورەکە و بۆ لای پێخەفەکەم، نێوچەوانی منی ماچ کرد و دەستی بە شانەکانمدا هێنا. ئینجا پێڵووی چاوەکانمی بەرز کردەوە و راستەوخۆ لە بەرانبەر چاوە بێ تەرکیز و بەتاڵەکانمدا تی "تۆ باش دەبیت، باوکە. تۆ باش دەبیت". ئەو بەردەوام بوو لە دووپاتکردنەوەی ئەو قسانە، دووبارە و دووبارە، بەو بڕوایە منداڵییەی کە ئەگەر چەند جارێکی پێویست دووپاتی کردەوە، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەیکاتە راستی.

لە هەمان کاتدا، لە ژوورێکی خوارەوەی هۆڵەکە، هۆڵی چاوی بڕیبووە بۆشایی و ئەوەندەی بیتووانیایە وشەکانی دکتۆر وەیدی وەردەگرت.

دواجار هۆڵی وتی، "وای بۆدەچم ئەمە بەو مانایە بێت کە دەبێ لە کۆلێژ تەلەفۆن بۆ ئێبێنی کورم بکەم و پێی بڵێم بگەڕێتەوە".

دکتۆر وەید لەسەر پرسەکە زۆر هەڵوەستەی نەکرد.

"بەڵێ، پێم وایە ئەمە کارێکی دروستە".

هۆڵی رایکردە لای پەنجەرەی گەورەی ژووری کۆنفرانسەکە کە بەسەر شاخە زریان لێدراو بەڵام درەوشاوەکانی ڤیرجینیادا دەیڕوانی، مۆبایلەکەی دەرهێنا و پەیوەندی بە ژمارەکەی ئێبێنەوە کرد.

کاتێك ئەمەی کرد، سیلڤیا لەسەر کورسییەکەی هەستا.

وتی "هۆڵی بوەستە، با جارێکی تر بچمەوە ژوورەکە".

سیلڤیا چووە ناو ژووری یەکەی چاودێریی ورد و لە تەك بۆندەوە وەستا کە بەبێ دەنگی دانیشتبوو و دەستی دەشێلام. سیلڤیا دەستی لەسەر باسکی دانام و بە نەرمی دەستی پێداهێنا. هەروەکو تەواوی هەفتەکە، سەرم کەمێك گۆڕابوو بۆ یەك دیو. بۆ هەفتەیەك، هەمووان دەیانڕوانییە ڕووخسارم، نەك ناوی. تاکە جارێك کە چاوەکانم کرانەوە ئەو کاتە بوو کە دکتۆرەکان پشکنینیان بۆ پەرچەکرداری کشان و هاتنەوەیەکی گلێنەکانم کرد بۆ رووناکی (یەکێك لە شێوازە سادە بەڵام کاریگەرەکان بۆ پشکنینی کارکردنی بەشی خوارەوەی مێشك)، یان کاتێك هۆڵی یان بۆند لەبەرانبەر رێنماییە دووبارەبووەوەکانی دکتۆرەکاندا سووربوون لەسەر ئەم کارە و رووبەڕووی دوو چاو ببوونەوە کە مردوو بوون و وەکو چاوەکانی بوکەڵەیەکی شکاو سوڕابوون.

بەڵام ئێستا، لەکاتێکدا کە سیلڤیا و بۆند دەیانڕوانیە روخساری مردووم، بە مکوڕییەوە رەتیان دەکردەوە ئەوە قبوڵ بکەن کە تازە لە دکتۆرەکەیان بیستبوو، شتێك روویدا.

چاوەکانم کرانەوە.

سیلڤیا قیژاندی. ئەو دواتر پێی وتم کە گەورەترین شۆکی دواتر، تەقریبەن ئەوەندەی کرانەوەی چاوەکانم، ئەوە بوو کە دەستبەجێ دەستیانکرد بە روانین لە دەوروبەر. سەرەوە، خوارەوە، ئێرە، ئەوێ. . . ئەم چاوانە پێگەیشتوویەکیان بیر نەخستەوە کە حەوت رۆژە لە کۆمادایە، بەڵکو منالێکیان بە خەیاڵدا هێنا- کەسێکی تازە لەدایکبوو لەم جیهانەدا، لە دەوری دەڕوانێت و بۆ یەکەم جار شتەکان وەردەگرێت.

بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەو لەسەر حەق بوو.

سیلڤیا لە شۆکە سەرەتاییەکەی هاتەوە تایم و درکی بەوە کرد کە من بەهۆی شتێکەوە شڵەژاوم. ئەو رایکردە دەرەوەی ژوورەکە بۆ ئەو شوێنەی کە هۆڵی هێشتا لای پەنجەرەکە وەستابوو و قسەی لەگەڵ ئێبێنی چوارەم دەکرد.

سیلڤیا هاواری کرد "هۆڵی. . . هۆڵی! ئەو بێدار بووەتەوە! بە ئێبێن بڵێ باوکی هەڵدەستێتەوە".

هۆڵی سەرنجی دایە سیلڤیا. لەسەر تەلەفۆن وتی "ئێبێن دەبێ تەلەفۆنت بۆ بکەمەوە. ئەو. . . باوکت. . . دەگەڕێتەوە بۆ ناو ژیان".

هۆڵی رۆیشت و پاشان رایکردە ناو ژووری یەکەی چاودێریی ورد، دکتۆر وەیدیش رێك بەدوایەوە بوو. بە دڵنیاییەوە من بێ ئارام بە دەوری جێگاکەمدا دەجوڵام. بەشێوەیەکی میکانیکی نا، چونکە بەئاگا بووم و شتێك بە روونی هەراسانی

دەکردم. دکتۆر وەید دەستبەجێ تێگەیشت چییە: ئەو لولەکەی هەناسەدان کە هێشتا لە قورگمدا بوو. لولەکێك کە چیتر پێویستم پێی نەبوو، چونکە مێشکم، لەگەڵ تەواوی جەستەم، تازە ژیانیان بە بەردا هاتبووەوە. ئەو هات، تێپی راگرتنەکەی پچڕاند و بە وریاییەوە دەریهێنا.

من کەمێك کۆکیم، هەناسەیەکی سروشتیی پاش حەوت رۆژم هەڵکێشا و یەکەمین ئەو وشانەم دەربڕی کە هەمدیس حەفتەیەك بوو دەرم نەبڕیبوون:

"سوپاس"

فیلیس هێشتا بیری لەو پەلکە زێڕینەیە دەکردەوە کە تازە بینیبووی کاتێك لە مەسعەدەکە هاتبووە دەرەوە. ئەو پاڵی بە دایکمەوە دەنا کە لەسەر کورسی موحەریك بوو. ئەوان بۆ ناو ژوورەکە هاتن و فیلیس لە نابڕواییدا بۆ دواوە ساتمەی کرد. من لەناو جێگاکەمدا دانیشتبووم و سەرنجم لە نیگاکانی ئەوان دەدایەوە. بێتسی هەڵدەپەڕی و فیلیسی لەباوەش گرت. هەردووکیان چاویان پڕ بوو لە فرمێسك. فیلیس هاتە نزیکتر و قووڵ روانییە ناو چاوەکانم.

منیش سەیرم کردەوە، پاشان روانیمە هەر کەسێکی تر کە لەوێ بوو.

لەکاتێکدا کە خانەوادە بەسۆز و پەرستارەکان لە دەوری جێگاکەم کۆ بوونەوە، هێشتا لەو گۆڕانکارییە روون نەکراوەیە واقیان وڕمابوو، من بزەیەکی شاد و ئارامم لەسەر لێوان بوو.

وتم "هەموو شتێ لە باشیدایە"، پەیامەکەم ئەوەندەی دەربڕینی قسەکان شادی لێدەباری. بە قووڵی روانیمە هەر یەکەیان، پەیم بە موعجیزەی ئاسمانیی بوونمان دەبرد.

قسەکانم دووبارە کردەوە بۆ نەهێشتنی گومان "نیگەران مەبن. . . هەموو شتێ لە باشیدایە". فیلیس دواتر پێی وتم وەکو ئەوە وابوو کە من لەو سەرەوە پەیامێکی گرنگ دەگەیەنم کە جیهان وەکو ئەوەی کە پێویستە ببێت، وایە، و ئەمەی کە پێویست ناکات لە هیچ بترسین.

ئەو وتی زۆرجار ئەوە ساتەی بیر دێتەوە کاتێك خەمێکی زەمینی سەرگەردانی دەکات– ئاسودەیی لەوەدا دەبینێتەوە کە دەزانێ ئێمە تەنیا نین.

کاتێك هەڵوەستەیەکم لەسەر ئامادەیی کۆمەڵە خەڵکەکە کرد، دیار بوو دەگەڕامەوە بۆ ناو ئەزموونی زەمینیم.

پرسیارم لەوانە کرد کە کۆ ببوونەوە "ئەوە چی دەکەن لێرە؟ "

فیلیسیش لە وەڵامدا وتی "تۆ چی دەکەیت لێرە؟ "

بەشی بیست و چوار

# گەڕانەوە

بۆند وێنای ئەوەی دەکرد کە هەمان باوکی پێشووی لە خەو بێدار دەبێتەوە، سەیرێکی دەوروبەری دەکات و تەنیا پێویستی بە کەمێ وردبوونەوە هەیە لەمەڕ ئەوەی کە چی ڕوویداوە پێش ئەوەی ڕۆڵی ئەو باوکە بگرێتە ئەستۆی کە هەمیشە ناسیویەتی.

لەگەڵ ئەوەشدا بەزوویی بۆی دەرکەوت کە بابەتەکە هەروا ئاسان نییە. دکتۆر وەید لەبارەی دوو شتەوە هۆشداری دایە بۆند: یەکەم، نابێ متمانە بکاتەسەر ئەوەی من شتێکم لەبیر بێت کاتێك کە لە کۆمایەکەم هەڵدەستمەوە. ئەوەی بۆ ڕوونکردەوە کە زاکیرە هێزێکی مێشکی زۆری دەوێ و مێشکی من ئەوەندە نەهاتووەتەوە سەر خۆ تا لەو ئاستە ئاڵۆزەدا کار بکات. دووەم، نابێ ئەوەندە نیگەرانی ئەو شتانە بێت کە لەو ڕۆژانەی سەرەتادا وتوومە، چونکە ئیتر بڕێکی زۆری بەشێوەیەکی شێتانە دەهاتە بەرچاو.

لە هەردوو ڕووەوە ڕاستی دەکرد.

بە هاتنی ئەو بەیانییە، بۆند بە شانازییەوە ئەو وێنەیەی پیشاندام کە لەگەڵ ئێبێنی چوارەم بۆ بۆ خڕۆکە سپییەکانی خوێن کە هێرشیان دەکردە سەر بەکتریای ئی کۆلای، کێشابوویان.

بۆند رووی زۆر گەش و شاد بوو.

وتم "بارودۆخی دەرەوە چۆنە؟ من ئامادەم لە جێگاکەم بێمە دەرەوە! "

من لە دۆخێکی بێ وێنەدابووم، کاتە هەرە خۆشەکانی ژیانم دەژیامەوە، لە زیندووترین فۆرمیشدا.

لە مێشکی خۆمدا، من پڕ جۆش و خرۆش بووم ئامادە بووم لە فڕۆکە بێ ماتۆڕەکانەوە لە دوورایی سێ مایڵ باز بدەمە خوارەوە. . . هەر لە مێشکی خۆمدا لەبەر خۆرەتاو دەرگای فڕۆکەکەم دەکردەوە و دەستبەجێ بە ئاراستەی سەرم بازم دەدا و هەستێکی دڵڕفێنم هەبوو.

لەکاتێکدا کە هەر لە هەوا بووم پەلەکانم زیاتر دەهێنانەوە یەك و خێراییم زیاد دەکرد، بایەکە بە توندییەکی زۆر لێیدەدام. لەکاتێکدا کە بە نێوان دوو پەڵە هەوری سپیدا تێپەڕیم، رۆکێت ئاسا بەناو کەلێنێکی رۆشندا رەت بووم و سەوزایی زەوی و دەریای شینی قووڵی درەوشاوە لە دوورایی خوارەوە دەردەکەوت. پەیتا پەیتا دەهاتمە پاڵ ئەڵقەی پەڕەشوتەوانیی هاوڕێکانم کە بە ئەستەم دیار بوون و تا دەهات لێك دەبوونەوە.

من لە پەت پەتێنی هاتن رۆیشتنەوەی نێوان ئامادەبوون لە ژووری یەکەی چاودێری و لە وەهمەکانی وەهمە پڕ جۆش و خرۆشەکانی پەڕەشوتەوانیدا بووم.

بۆ ماوەی دوو رۆژ هەر هەڵیت و پەڵیتم لەبارەی پەڕەشوتەوانی، فڕۆکەکان و ئینتەرنێت دەوت بۆ هەر کەسێك کە گوێی لێ بگرتمایە. لەکاتێکدا کە مێشکی

جەستەییم پەیتا پەیتا ئەو شتانەی کە لەسەری بوون بۆی دەهاتنەوە، کەوتمە ناو گەردوونێکی نامۆ و تاقەتبەرەوە. خوومگرت بە باکگراوندێکی دزێوی "مێسجەکانی ئینتەرنێت" کە هەر کاتێك چاوەکانم لێك دەنان دەردەکەوتن و هەندێ جار کاتێك کراوە بوون بە بنمیچەکانەوە دەمبینین. کاتێك چاوەکانم دادەخستن گوێبیستی دەنگە ناخۆشە سواوە بێ ئاوازەکان دەبووم و زۆرجار ئەو کاتە نەدەمان کە دەمکردنەوە.

بە کورتی کەمێك شێت بووم.

وەکو ئەوە وابوو کەمێك کەوتبمە ناوچەی روانگەی چاوی کرمەوە، هەرچەندە کەمێك زیاتر مۆتەکەئاسا بوو، چونکە ئەوەی گوێم لێ دەبوو گرێبەند بوو بە رابردووی مرۆییم (ناوی ئەندامانی خانەوادەکەم دەناسییەوە، هەرچەندە وەکو لە حالەتی هۆڵی-دا، ناوەکانم لەیاد نەبوون).

بەڵام لە هەمان کاتدا، بە تەواوی لەو رۆشنییە سەرسوڕهێنە و دەوڵەمەندییە زیندووەی کەمبوو- ئەو سەروو واقیعەی دەروازەکە و چەقەکە. بە تەواوی دڵنیاییەوە گەڕابوومەوە سەر مێشکی خۆم.

وێڕای ئەو ساتەوەختە سەرەتاییەی خەیاڵپڵاوی کاتێك چاوەکانم کردنەوە، بە زوویی جارێکی تر هیچ یادەوەریم نەبوو لە ژیانی مرۆیی پێش کۆمام. یادەوەریم لەو شوێنە بوو کە تازە لێی بووم: ناوچەی ناخۆش و دزێوی روانگەی چاوی کرم، دەروازە نموونەییەکە و چەقەکە ئیلاهییە بێ هاوتاکە. ئەقڵم- خودی راستەقینەم- فشاری دەهێنا بەرەو قاڵبی سنووردار و بەرتەسکی بوونی فیزیکی بە بەرجەستەییەکەیەوە، بیرکردنەوە راستەهێڵییەکەیەوە و سنووردارییەکەی بۆ اتصالی زارەکی. ئەو شتانەی کە تاوەکو هەفتەیەك لەوەوپێش پێم وابوو تاکە

فۆرمی بوونن لە دەوروبەرم، بەڵام ئێستا خۆیان وەکو سنووربەندیی بێ ڕادە سەخت پیشان دەدەن.

ژیانی فیزیکی بەرگریکارانەیە لەکاتێکدا کە ژیانی ڕۆحی ڕێك پێچەوانەیە. ئەمە تاکە ڕوونکردنەوەیە کە لام دروست بوو بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمەی کە بۆچی گەڕانەوەم ترس بەخش بوو. بۆ کاتێکی دیاریکراو لەسەر ئەو قەناعەتە بووم کە هۆڵی (کە ناوەکەیم هێشتا نەدەهاتەوە یاد بەڵام بەشێوەیەك لە شێوەکان درکم بەوە دەکرد خێزانمە) و پزیشکەکان هەوڵ دەدەن بمکوژن. خەو و خەیاڵی زیاترم هەبوو لەبارەی فڕۆکەوانی و خۆهەڵدان بە هەوادا- هەندێکیان بێ ڕادە درێژ و چڕوپڕ بوون. لە یەکێك لەو درێژترین حاڵەتە چڕوپڕانە و تەقریبەن پڕوپوچانەدا خۆم لە کلینیکی شێرپەنجەی (ساوز فلۆریدا) بینییەوە کە قادرمەی کارەبایی لە دەرەوەیدا هەبوو، هۆڵی، دوو ئەفسەری پۆلیسی (ساوز فلۆریدا) و دوو فۆتۆگرافەری نینجای ئاسیایی بەسەر کێبڵەکاندا بەدوامەوە بوون.

لە ڕاستیدا من بە شتێکدا تێپەڕ دەبووم کە پێی دەوترا "ئای سی یو سایکۆسیس" و ئاسایی و تەنانەت چاوەڕوانەکراویش بوو بۆ ئەو نەخۆشانەی کە مێشکیان دەهاتەوە سەر هێڵ پاش ئەوەی ئەوەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر ناچالاك بووە. خۆم زۆر جار ئەمەم بینیووە، بەڵام قەت ناوەرۆکەکەیم نەزانیووە و بێگومان لە ناوەوەڕا زۆر زۆر جیاواز بوو.

لەبەرانبەردا سەیرترین شت لەبارەی ئەو دۆخانەی مۆتەکە و خەیاڵی ترس بەخش ئەوەیە هەمووی یەك شت بوو: خەیاڵپڵاوی. چەند بەشێکی- بەتایبەت مۆتەکەی درێژبووەوەی نینجای ساوز فلۆریدا زۆر چڕوپڕ بوون و لەکاتی ڕوودانیاندا تەواو تۆقێنەر بوون. بەڵام لەبەرانبەردا- لە ڕاستیدا تەقریبەن ڕاستەوخۆ پاش

ئەوەی ئەم ماوەیە تەواو بوو– هەموو وەکو خۆی ناسرایەوەك شتێکی سازدراو لەلایەن مێشکمەوە لەکاتێکدا کە لە گەڕانەوە بۆ دۆخی ئاساییدا بووە. هەندێ لەو خەونانەی لەو ماوەیەدا بینیمن بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن و تۆقێنەر بەرجەستە و زیندوو بوون. بەڵام لە کۆتاییدا تەنیا ئەوەیان پیشاندا کە یەکجار زۆر جیاواز و ناهاوشێوەن لەگەڵ ئەو سەروو واقیعە قووڵەی ناو کۆماکەم.

هەرچی پەیوەندی بە رۆکێتەکان، فڕۆکەکان و خۆهەڵدان لێیانەوە هەیە کە بە بەردەوامی وێنام دەکردن، دواتر بۆم دەرکەوت کە لە روانگەیەکەوە تەواو مەعقولە. چونکە راستییەکەی ئەوە بوو کە من گەڕانەوەیەکی مەترسیدارم هەبوو لە شوێنێکی دوورەدەستەوە بۆ وێستگەی چالاکی مێشکم کە جارێك لە جاران چۆڵ کرابوو.

بەشی بیست و پێنج

# هێشتا لەوێ نیم

بۆند تاکەکەس نەبوو کە گرفتی هەبوو لە قبوڵکردنی ئەو کەسایەتییە نامۆیەی چەند رۆژی یەکەمی گەڕانەوەم. رۆژی پاش ئەوەی هۆشم هاتەوە سەر- دووشەممە- فیلیس تەلەفۆنی بۆ ئێبێنی چوارەم کرد لە رێگەی سکایپەوە.

هۆڵی وتی "ئێبێن، ئەمە باوکتە" رووی کامێراکەی کردە من.

ئێبێن بە رووگەشەییەوە وتی "سڵاو باوکە! وەزعت چۆنە؟ "

بۆ ماوەی خولەکێك تەنیا خەندەیەکی سارد و سرم بۆ شاشەی کۆمپیوتەرەکە کرد. کاتێك دواجار دەستم کرد بە قسە، ئێبێن شاگەشکە بوو لە خۆشیا. من بەشێوەیەکی ئازاربەخش خاو بووم لە قسەکردن و وشەکانم مانایەکی کەمیان هەبوو. ئێبێن دواتر پێی وتم "تۆ لە مرۆڤخۆرەکان دەچوویت- وەکو کەسێك کە تریاکێکی زۆری بەکاربردبێت". بەداخەوە ئەو هیچی لە ئەگەری "ئای سی یو سایکۆسیس" نەدەزانی.

پەیتاپەیتا ترسەکەم نەما و بیرکردنەوە و وتوێژەکانم زیندووتر بوون. دوو رۆژ پاش هەستانەوەم، گواسترامەوە بۆ یەکەی جێهێشتنی زانستی دەماری.

پەرستارەکان دوو پێخەفیان دایە فیلیس و بێتسی بۆئەوەی لە تەنیشت منەوە بخەون. متمانەم بە کەس نەبوو جگە لەو دووانە– ئەوان ئارامبەخش بوون بۆم، رایەڵ بیوون بە واقعییەتە نوێکەمەوە.

تاکە گرفت ئەوە بوو کە من نەخەوتم. بە درێژایی شەو ئەوانم بێدار هێشتەوە، دەچوومە سەر ئینتەرنێت، وێستگە فەزاییەکان، دوو سیخوڕە روسییەکە و هەموو شتێکی پڕوپوچی پەیوەندیدار. من وەکو ساوایەك بووم کە کاتی خەوتنی نەبوو.

لە ساتە هێمنترەکانمدا فیلیس و بێتسی یارمەتیان دەدام تا بە هێواشی بمگەڕیننەوە سەر زەوی. ئەوان هەموو جۆرە بەسەرهاتێکی منداڵیمانیان بۆ باس دەکرد و هەرچەندە بەشی زۆری وەکو ئەوە وابوو یەکەجار بێ گوێیان لێبگرم، سەرسام بووم. چەندەی زیاتر قسەیان بکردایە، ئەوەندە زیاتر شتێك لەناو ناخمدا بەرجەستە دەبوو– درك کردن بەوەی کە لە راستیدا خۆم لەناو ئەو رووداوانە بووم.

دوو خوشکەکانم دواتر پێیان وتم، زۆر بە خێرایی ئەو برایەی کە دەیانناسی دەرکەوتەوە.

دواتر بێتسی پێی وتم " بێ وێنە بوو. تۆ تازە لەو کۆمایە دەهاتیە دەر، بە تەواوی بەئاگا نەبوویت کە لە کوێیت یان چ دەگوزەرێت، نیوەی کاتەکە باسی هەموو شتێکی شێتانەت دەکرد بەڵام سوعبەتی جارانت هەر پێوە دیار بوو. بە ئاشکرا هەر خۆت بوویت. ئیتر گەڕابوویتەوە ! "

لەکاتێکدا کە ماکینەی وەستاو بەشێوەی کاتیی مێشکم زیاتر کەوتنەوە گەڕ، تەماشای خۆم دەکرد کە هەندێ شتم دەکرد و ڕادەمام: ئەوە لە کوێوە هاتووە؟ زووتر هاوڕێیەکی (لینچبێرگ)م بەناوی جاکی هاتبووە دیدەنیم. من و هۆڵی جاکی و (رۆن)ی مێردیمان دەناسی کە خانووەکەمان لێیان کڕیبوو. بەبێ ئەوەی

ئارەزوومەندی ئەوە بم، غەریزە کۆمەڵایەتییەکانم دەستپێشخەرییان کرد و دەستبەجێ پرسیارم کرد، "رۆن چۆنە؟"

پاش چەند رۆژێکی تر، وتوێژە زیندووەکانم لەگەڵ سەردانکەرانم زیادیان کرد و جارێکی تر مایەی سەرسامی بوو کە بینیم چەنێك لەو پەیوەندییانە تۆتۆماتیکین و لەلایەن منەوە پێویستیان بە تەقەلایەکی زۆر نەبوو. وەکو فرۆکەیەکی بێ فرۆکەوان، مێشکم بەشێوەیەك لە شێوەکان زاڵ بوو بەسەر ئەو دیمەنانەی ئەزموونی مرۆیی کە ئاشنا و ئاشناتر دەبوون. دەبووم بە یەکەم کەس کە راستییەك پیشان بدەم و وەکو نەشتەرگەرێکی مێشك باش دەمزانی: مێشك بە راستی میکانیزمێکی بێ هاوتایە.

بێگومان، پرسیاری قسە لەسەرنەکراو لە مێشکی هەر کەسێکدا (بە منیشەوە لەو ساتانەدا کە بەئاگاتر بووم) ئەمە بوو: تا چ ئاستێك باش دەبمەوە؟ ئایا بە راستی تەواو چاك دەبوومەوە یان نا. کۆلای لانی کەم ئەو کەمە زیانەی گەیاندبوو کە هەموو دکتۆرەکان دڵنیا بوون لێی؟ ئەم چاوەڕوانییە رۆژانەیە کاری کردبووە سەر هەموان، بەتایبەت هۆلی کە دەترسا لەپڕێکا بەرەوپێشچوونە موعجیزەئاساکە بوەستێت و تەنیا کەمێك لەو "من"ەی بۆ بمێنێتەوە کە ناسیبووی.

لەگەڵ ئەوەشدا، رۆژ لەدوای رۆژ، بەشێکی زیاتر و زیاتر لەو "من"ە دەگەڕایەوە. زمان، یادەوەرییەکان، ناسینەوە. تاکە نیشانەیەك کە منی پێناسرابووم تیامدا پەیدا بووەوە.

هەموان سەریان سوڕما لە خێرایی چاکبوونەوەم -جگە لە خۆم- چونکە هێشتا بە راستی نەدەمزانی تا چ ئاستێك لە مردن نزیك کەوتوومەتەوە. لەکاتێکدا کە هاوڕێیان و خزمان بەرەبەرە بەرەو ماڵ دەبوونەوە، من خۆشبەختانە بێ ئاگا بووم

لەو تراژیدییەی کە لەسەر لێوار گەڕایەوە. ئەوەندە پڕ وزە و جۆش و خرۆش بووم کە یەکێك لە دەمارناسەکان کە پشکنینی بۆ کردم بۆ دانانم لە بوژانەوەدا، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە من "لەڕادەبەدەر دڵخۆش"م و لەوانەیە تووشی زیانی مێشك هاتبم. ئەو دکتۆرەش وەکو من قات و بۆنیباخ پۆشێکی ئاسایی بوو و لەبەرانبەر ئەو قسەیەی لە پشکنینەکەیدا پێی وتم منیش پاش ئەوەی ڕۆیشت بە خوشکەکانم وت "بە راستی ئەو کابرایە وەکو کەسێکی قات و بۆنیباخ پۆش هیچ هەستێکی نییە".

تەنانەت ئەو کاتەش شتێکم دەزانی کە خەڵکێکی زیاتر و زیاتری دەوروبەرم بەرەبەرە قبوڵیان دەکرد. دکتۆرەکان بڵێن یان نەڵێن، من نەخۆش نیم و مێشکیشم عەیبی نییە. بە تەواوی باشم.

لە راستیدا- هەرچەندە تا ئەو ساتەش تەنیا من دەمزانی- بە تەواوی و بە راستی بۆ یەکەمین جار لە تەواوی ژیانمدا "باش" بووم.

بەشی بیست و شەش

# گەیاندنی هەواڵەکە

لەکاتێکدا کە مەعریفەی دەمارناسیم بە هێواشی و ترسنۆکانە پاشەکشەی کرد، یادەوەرییەکانم لە هەفتەی چوونە دەرەوە لە جەستەم بە بوێری و رۆشنییەوە هاتنەوە یادم. ئەوەی کە لە دەرەوەی رووبەری زەمینیی روویدابوو پەیوەندی هەبوو بە ئەو خۆشحاڵییە بێ وێنەیەی هەمبوو کە بێدار بوومەوە و نیعمەتەکە لەگەڵمدا مایەوە. من بێ رادە دڵشاد بووم چونکە گەرامەوە لای ئەو خەڵکەی خۆشم دەویستن. بەڵام بەهەمان شێوە خۆشحاڵ بووم لەبەرئەوەی- بە دەربڕینێکی ئەوەندەی بۆم بکرێ روون- بۆ یەکەمین جار تێگەیشتم کە بە راستی کێم و لە چ جۆرە جیهانێکدا نیشتەجێین.

من بەشێوەیەکی کێوییانە- و ساویلکانە- تامەزرۆی ئەم ئەزموونانە بووم، بەتایبەت لەگەڵ هاوەڵە دکتۆرەکانم. دواجار، ئەوەی کە پیایدا تێپەڕیبووم بیروباوەڕە درێژخایەنەکانی لەبارەی ئەوەی کە مێشک چییە، ئاگایی چییە و تەنانەت خودی ژیان چ مانایەکی هەیە-و چ مانایەکی نییە- وەرچەرخاندبووم. کێ بە بیستنی دۆزینەوەکانم ناشڵەژێ؟

هەروەکو دەرکەوت، خەڵکێکی یەکجار زۆر کەم. بەتایبەت خەڵکی خاوەن بڕوانامەی پزیشکی. گومانی تێدا نییە کە دکتۆرەکان زۆر خۆشحاڵ بوون لە بەرانبەر مندا. دەیانوت "ئێبێن ئەمە بێ وێنەیە" نمایشی ئەو کاردانەوەیەی منیان دەکرد لە بەرانبەر ئەو ژمارە زۆرەی نەخۆش کە لە رابردوودا هەوڵیان دەدا باسی ئەزموونەکانی ئەودیو ژیان بۆ من بکەن کاتێك تووشی حاڵەتەکە هاتبوون. "تۆ زۆر نەخۆش بوویت. مێشکت نقوم بوو لە کێم و جەراحەت. ناتووانین بڕوا بکەین کە ئێستا بۆ تۆی باس دەکەین. تۆ خۆت دەزانیت کە دەشێ مێشك چی لێبێت کاتێك دەگاتە ئەو ئاستە".

بە کورتی، ئەقڵیان ئەوەی بڕ نەدەکرد کە من دەمویست بیگێڕمەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چۆن دەتووانم لۆمەیان بکەم؟ دواجار، منیش بوومایە (پێشتر) تێ نەدەگەیشتم.

بەشی بیست و حەوت

# هاتنەوە بۆماڵەوە

لە ٢٥ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٨دا، دوو ڕۆژ بەر جەژنی سوپاسگوزاری، هاتمەوە ماڵێکی پڕ لە سوپاسگوزاری. دوایین جار کە لەگەڵما بوو، لە کۆمایەکی تەواودا بووم و ئەو هێشتا دڵەی بەوەوە لێدا بوو کە چۆنە زیندووم.

من چەند سەعاتێك بوو بێدار بووم، لە ژووری خوێندنەوەدا لەسەر کورسییەکی ئاسودەبەخشی نزیك ئاگردانەکەوە دانیشتبووم و بیرم لە هەموو ئەو شتانە دەکردەوە کە پیایدا تێپەڕیبووم. ئێبێن ڕێك پاش ٦ی سەر لە بەیانی لە دەرگاکەوە چووە دەرەوە، من وەستام و لە باوەشم گرت. زۆر کارتێکراو بوو. دوایین جار کە منی لەسەر سکایپ بینی لە نەخۆشخانە، بە ئەستەم دەمتووانی تاکە رستەیەك پێکەوە بنێم. ئێستا– هەرچەندە هێشتا بوتڵەئاوێکم بۆ هەڵواسراوە– گەڕابوومەوە بۆ ناو ڕۆڵی دڵخوازم لە ژیاندا– ئێبێن و باوکی بۆند.

ئێبێن لە شتێکی تر بەئاگابوو کە سەبارەت بە من جیاواز بوو. دواتر، ئێبێن وتی کاتێك یەکەم جار ئەو ڕۆژە منی بینیووە، دەستبەجێ سەری سوڕماوە کە چەنێك "ئامادە"م.

وتی "تۆ زۆر رۆشن و زۆر بە تەرکیز بوویت. وەك بلێی جۆرە رووناکییەك لەناوتا شەوق دەداتەوە".

من هیچ کاتم بە فێرۆ نەدا لە باسکردنی بیرۆکەکانم.

پێم وت "من زۆر تامەزرۆم کە چەندەی دەتووانم لەسەر ئەمە بخوێنمەوە. ئێبێن، زۆر واقعی بوو، تەقریبەن لەوە واقعیتر بوو کە واقعی بێت، ئەگەر ئەمە هیچ مانایەکت لا دروست دەکات. دەمەوێ لەبارەی ئەمەوە بۆ زاناکانی تری دەمارناسی بنووسم. و دەمەوێ جارێکی تر لەبارەی ئەزموونەکانی نزیکە مەرگ و ئەوەی کە خەڵکی تر ئەزموونیان کردووە بخوێنمەوە. بڕواناکەم کە قەت هیچ کام لەمانەم بەجددی نەگرتووە، قەت گوێم بۆ ئەوە شل نەکردووە کە نەخۆشەکانم پێیان دەوتم. قەت ئەوەندە بەجۆش نەبووم تەنانەت سەیرێکی ئەو ئەدەبیاتەش بکەم".

ئێبێن سەرەتا هیچی نەوت، بەڵام بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن بە باشترین شێوە ئامۆژگاری باوکی بکات. لەبەرانبەر من دانیشت و پێی وتم کە ئەوە ببینم کە بە راستی روون بووە. وتی "بڕوات پێ دەکەم باوکە، بەڵام بیری لێ بکەرەوە. ئەگەر دەتەوێ ئەمە بەهایەکی بۆ ئەوانیتر هەبێت، دوایین شت کە دەبێ تۆ بیکەیت خوێندنەوەی قسەی خەڵکانی ترە".

پرسیارم کرد "کەواتە دەبێ چی بکەم؟ "

"بینووسەرەوە. هەموو یادەوەرییەکانت ئەوەندەی کە دێتەوە بیرت بە وردی و دەقاودەقی بنووسەرەوە. بەڵام هیچ کتێبێك یان وتارێك لەبارەی ئەزموونەکانی نزیکە مەرگی خەڵکی تر، یان گەردووناسی یان فیزیا مەخوێنەرەوە. تا ئەو کاتەی ئەوەی کە بەسەرت هاتووە دەنووسیتەوە. لەبارەی ئەوەوە کە لە کۆمادا بەسەرت هاتووە لای دایکیشم باس مەکە. دەتووانیت دوایی ئەمە بکەیت وانییە؟ بیر لەوە بکەوە کە چۆن هەمیشە پێت وتووم یەکەمجار تێبینیکردن دێت ئینجا لێکدانەوە.

ئەگەر دەتەویٚ ئەوەی بەسەرت هاتووە بەهایەکی زانستی هەبیٚ، دەبیٚ ئەوەندەی بۆت بکریٚت بە بیٚگەردی و دەقاودەقی تۆماری بکەیت پیٚش ئەوەی بەراوردی بکەیت بەوەی بەسەر ئەوانیتردا هاتووە".

لەوانەیە ئەمە داناترین ئامۆژگاری بووبیٚت کە تاوەکو ئەو کاتە یەکیٚك کردبیٚتمی– منیش گویٚم لیٚگرت. ئیٚبیٚن لەوەشدا تەواو راست بوو کە ئەوەی، زیاتر لە هەر شتیٚکی تر، بە قوولی دەمویست بەکارهیٚنانی ئەزموونەکانم بوو بۆ یارمەتیدانی ئەوانیتر، ئەگەر بکریٚ. چەندە ئەقڵی زانستیم بۆ گەڕایەوە، ئەوەندە روونتر بینیم کە چەنیٚك بەشیٚوەی ریشەیی ئەوەی لە زیاتر لە بیست ساڵی خویٚندن و مومارەسەی پزیشکی فیٚری بووم لەناکۆکیدایە لەگەڵ ئەوەی ئەزموونم کردووە، زیاتریش لەوە تیٚگەیشتم کە ئەقڵ و کەسایەتی (کە هەندیٚ کەس پیٚی دەڵیٚن رۆح یان گیان) لەودیو جەستەوە بوونی بەردەوامی هەیە. دەبووایە بەسەرهاتەکەم بە جیهان بگەیەنم.

بۆ ماوەی نزیکەی شەش هەفتەی دواتر، زۆربەی رۆژەکان هەروەکو خۆیان بوون. دەوری ٢ یان ٢: ٣٠ی بەرەبەیان هەڵدەستام، تەنیا بەوەندەی کە زیندووم هەستیٚکی بیٚ پایانی شادی و جۆش و خرۆشم هەبوو. لە ژووری خویٚندنەوەکە ئاگرم دادەگیرساند، لەسەر کورسییە چەرمییە کۆنەکەم دادەنیشتم و دەستم دەکرد بە نووسین. هەوڵمدا هەموو وردەکارییەکی گەشتەکانم لە ناوەوە و دەرەوەی چەقەکە و ئەوەی کە وەکو وانەی ژیان گۆڕ هەستم پیٚی کرد بنووسمەوە.

هەرچەندە (هەوڵمدا) بە راستی وشەیەکی دروست نییە. یادەوەرییەکان ریٚك و رەوان لەویٚ بوون، لەو شویٚنەی کە جیٚم هیٚشتبوون.

بەشی بیست و هەشت

# سەروو واقیع

دوو رێگا هەیە بۆئەوەی بە فریو بخۆیت. یەکێکیان ئەوەیە بڕوا بەوە بێنیت کە راست نییە. ئەویتریان بڕوا نەهێنیت بەوەی کە راستە.

سۆرێن کێرکەگارد (١٨١٣–١٨٥٥)

لە هەموو ئەو نووسینەدا، پێدەچوو وشەیەك دووبارە و دووبارە بێتەوە. (واقیعی)

پێش کۆماکەم، قەت نەمدەزانی وشەکە ئەوەندە فریودەرە. ئەو شێوازەی کە فێری بووم بەهۆیەوە بیری لێبکەمەوە، چ لە سکوڵی پزیشکی و چ لەو قوتابخانەیەی ئەقڵییەتی باو کە پێی دەوترێت ژیان، ئەوەیە کە شتێك یان یان واقیعییە (رووداوی ئۆتۆمبێل، یاری تۆپی پێ، لەفەی سەر مێزی بەردەمت) یان وەها نییە. لە ساڵانی کارمدا وەکو نەشتەرگەری دەمار و مێشك، خەڵکێکی زۆرم بینیووە کە بە وڕاوە و خەیاڵ (شت هاتنەبەرچاو)دا ڕەت بوون. پێم وابوو دەزانم کە چ دیاردەیەکی ناواقیعیی تۆقێنەر بێ کە ئەزموونی دەکەن. لەماوەی چەند

ڕۆژی (ئای سی یو سایکۆسیس)مدا، هەلی ئەوەشم هەبوو کە نموونەی کاریگەری مۆتەکە واقعییەکانیش بەدی بکەم.

بەڵام هەر کە تێپەڕین، بە خێرایی ئەو مۆتەکانەم ناسییەوە و زانیم کە وەهمن: وەهمی دەماریی کە بەهۆی سیستەمی مێشکەوە پەیدا دەبن و لە ململانێدان کە جارێکی تر بێنەوە کایەوە.

بەڵام لەکاتێکدا کە لە کۆمادا بووم، مێشکم بە نارێکی ئیشی نەدەکرد. بگرە هەر بە هیچ شێوەیەکی ئیشی نەدەکرد. ئەو بەشەی مێشکم کە ساڵانێکی سکوڵی پزیشکی فێری کردبووم بەرپرس بوو لە دروستکردنی ئەو جیهانەی تیایدا ژیام و جوڵام و لە وەرگرتنی ئەو داتا خاوەی کە لە رێگەی هەستەکانمەوە دەهاتە ناوەوە و فۆرمەلەکردنی لە گەردوونێکی واتادار دا: ئەو بەشەی مێشکم کەوتبوو و نەمابوو. لەگەڵ ئەوەشدا، سەرباری هەموو ئەمەش، زیندوو و بەئاگا بووم، بە راستی بەئاگا، لە گەردوونێکدا کە لەسەروو هەموو شتێکەوە خۆشەویستی، ئاگایی و واقیع لە تایبەتمەندەکانی بوون. (جارێکی تر ئەو وشەیە پەیدا بووەوە). بۆ من، هیچ مشتومڕکردنێك لەسەر ئەم راستییە نەبوو. ئەوەندە بە تەواوی دەمزانی تا خوا ئەڵێ بەس.

ئەوەی ئەزموونم کرد زۆر واقیعیتر بوو لەو خانووەی تیایدا دادەنیشتم، زۆر واقیعیتر بوو لەو کۆلکە دارانەی لە ئاگردانەکەدا دەسووتان. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بوارێك بۆ ئەو واقعیەتە نەبوو لە جیهانبینی زانستیی راهێنراوی پزیشکیدا کە من ساڵانێکم بە خۆپێگەیاندن تیایدا بەسەر برد.

من چۆن دەمتوانی بوارێك بێنمەکایەوە بۆئەوەی هەردووی ئەم واقعیەتە پێکەوە بژین؟

بەشی بیست و نۆ

# ئەزموونێکی هاوبەش

دواجار ئەو رۆژە هات کە هەموو ئەو شتەی توانیم نووسیم، دوایین یادەوەریی ناوچەی روانگەی چاوی کرم، دەروازەکە و چەقەکە.

پاشان ئێستا کاتی خوێندنەوە هاتبوو. من بازم دابووە ناوە ئۆقیانووسی ئەدەبیاتی ئەزموونی نزیکە مەرگ- ئۆقیانووسێك کە پێشتر هەرگیز پەنجەم لێنەدابوو. زۆری پێنەچوو کە دەرکم بەوە کرد ژمارەیەکی بێ سنووری خەڵکی ئەو شتانەی منیان ئەزموون کردبوو، هەم لەم ساڵانەی دواییدا و هەم پێش چەند سەدەیەك. ئەزموونەکانی نزیکە مەرگ هەموویان وەکو یەك نین، هەریەکەیان ناوازەیە- بەڵام هەمان ئەو تایبەتمەندییانە دووبارە و دووبارە دەردەکەونەوە و زۆرێکیان من لە ئەزموونی خۆمەوە ناسیومنەوە. گێڕانەوەی رەتبوون بە تونێل یان دۆڵێکی تاریکدا بەرەو دیمەنێکی رۆشن- سەروو واقیع- ئەوەندەی میسر و یۆنان کۆنە. بوونەوەرە فریشتەئاساکان- هەندێ جار باڵیان هەیە و هەندێ جار نا- دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی خۆرهەڵاتی نزیکی کۆن- هەروەها ئەو بڕوایەش کە ئەو بوونەوەرانە پاسەوان بوون و چاودێریی چالاکییەکانی خەڵکی سەر زەوییان کردووە

و سڵاویان لەو خەڵکانە کردووە کاتێك لەدوای خۆیان جێیان هێشتوون. هەستی توانینی بینین لە هەموو ئاراستەکانەوە لە یەك کاتدا، هەستکردن بە بوون لەسەروو زەمەنی راستەهێڵییەوە– لە جەوهەردا، بوون لەسەروو هەموو شتێکەوە کە من پێشتر وەکو پێناسەکەری دیمەنی ژیانی مرۆیی، بیستنی مۆسیقای شێوە سرود کە دەهاتەناو بوونتەوە نەك گوێچکەتەوە، وەرگرتنی راستەوخۆ و دەستبەجێی چەمکەکان بەبێ هیچ کۆششێك کە بە دۆخی ئاسایی کاتی زۆر و توێژینەوەی زۆریان دەوێ. . . هەستکردن بە چڕیی خۆشەویستی بێمەرج، بڕم لێکردبوونەوە.

دووبارە و دووبارە، لە گێڕانەوەکانی ئەزموونی نزیکە مەرگی مۆدێرندا و نووسینە رۆحییەکانی سەردەمانی زوو، هەست دەکەم گێڕەرەوە ململانێیەتی لەگەڵ سنووربەندی زمانی زەمینیدا، هەوڵ دەدات تەواوی ئەو ماسییە بگرێت کە لەسەر بەلەمی زمان و ئایدیا مرۆییەکان گرتوویانە. . . و هەمیشە لە ئاستێك لە ئاستەکاندا شکست دێنن.

لەگەڵ ئەوەشدا، لەگەڵ هەر هەوڵێکدا کە بەشێوەیەکی نائومێدانە لە ئامانجەکەی کورت دەهێنێت، هەریەك لەو کەسانە لە زمان و ئایدیاکان هەڵدەکرێنێت بۆئەوەی ئەو گەورەییە بگەیەنێتە خوێنەر، من لە مەبەستی حیکایەتبێژ و ئەوەی کە هیوادار بوو لە هەموو شکۆمەندییە بێسنوورەکەیدا بیگەیەنێت بەڵام نەیدەتوانی، تێدەگەیشتم.

لەکاتێکدا کە دەمخوێندەوە لەبەر خۆمەوە دەموت بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ!. تێدەگەم.

بێگومان ئەم کتێبانە، ئەم بابەتە، هەموویان پێش ئەزموونەکەی من هەبوون. بەڵام قەت سەیرم نەکردبوون. نەك تەنیا بە خوێندنەوە، بەڵکو بە شێوازی تریش. هەروا بە سادەیی، من قەت باوەشم بۆ ئەو بیرۆکەیە نەکردووەتەوە کە لەوانەیە شتێك لە ئێمە لەدوای مەرگی جەستە بمێنێتەوە. من دکتۆرێکی خۆش مەشرەب و لەهەمان کاتیشدا بەگومان بووم. بەو شێوەیە، دەتووانم پێتان بڵێم زۆربەی گومانەکان بە راستی بەهیچ شێوەیەك گومان نین. بۆئەوەی بە راستی بەگومان بیت، دەبێ بە واقیعی شتەکە تاقی بکەیتەوە و بەجددی بیگریت. منیش، وەکو زۆرێك لە دکتۆرەکان، قەت کاتی ئەوەم دابین نەکردبوو کە تاووتوێی ئەزموونەکانی نزیکە مەرگ بکەم. تەنیا ئەوەم "دەزانی" کە ئەستەمن.

هەروەها بە تۆمارە پزیشکییەکانی کاتی کۆماکەمدا چوومەوە- ئەو کاتەی کە بەشێوەیەکی ورد بەشێوەیەکی کرداری هەر لەسەرەتاوە، تۆمار کرابوو. بە چاوخشاندن بە پشکنینەکانمدا هەروەکو چۆن ئەمە بۆ نەخۆشێکی خۆم دەکەم، دواجار بۆم روون بووەوە کە چ رادەیەکی بێ وێنە نەخۆش بووم.

مێنێنجایتسی بەکتریایی لەناو نەخۆشییەکاندا ناوازەیە لەو تایبەتمەندییەدا کە هێرش دەکاتە سەر ڕووی دەرەوەی مێشك لەکاتێکدا کە بونیادە قووڵترەکانی بێ زیان دەهێڵێتەوە. بەکتریاکە یەکەم جار بایی پێویست بەشە مرۆییەکەی مێشکمان تێکدەشکێنێت و دواجار بە هێرشکردنە سەر بونیادە "کەیبانوو" قووڵەکان کە زۆر لە ژێر بەشە مرۆییەکەوەیە، زۆر مەترسیدار دەبێ. هەلومەرجەکانی تر کە دەشێ زیان بە (نیۆکۆرتێکس) بگەیەنن و بینەهۆی بێهۆشی- برینی سەر، سەکتە، کەمخوێنیی مێشك یان وەرەمی مێشك- ئەوەندە کاریگەر نین بە بارەتەقای زیان پێگەیشتنی تەواوەتیی رووی نیۆرۆکۆرتێکس. ئەمە تەنیا بەشێکی نیۆرۆکۆرتێکس

دەگرێتەوە و بەشەکانی تر سەلامەت دەبن و دەتووانن ئیش بکەن. نەك تەنیا ئەوە، بەڵکو لەبری جیاکردنەوەی نیۆرۆکۆرتێکس، بەهەمان شێوە زیان لە بەشە قووڵتر و سەرەتاییترەکانی مێشکیش دەگەیەنن. بەلەبەرچاوگرتنی هەموو ئەمانە، مێنێنجایتسی بەکتریایی بە بەڵگەوە باشترین نەخۆشییە کە مرۆڤ بیەوێ ئەگەر سۆراخی ئەوە بکات مردنی مرۆیی تاقی بکاتەوە بەبێ ئەوەی وابکات بە راستی رووبدا. (هەرچەندە بێگومان زۆربەی کات روودەدات. راستیی خەمناك ئەوەیە کە تەقریبەن هەر کەسێکی نەخۆشی وەکو من کە تووشی مێنێنجایتسی بەکتریایی ببوو قەت ناگەڕێتەوە بۆئەوەی حیکایەتەکە بگێڕێتەوە).

هەرچەندە ئەزموونەکە ئەوەندەی مێژوو کۆنە، "ئەزموونی نزیکە مەرگ" (بە چاوپۆشیکردن لەوەی کە ئاخۆ وەکو شتێکی واقعی یان فەنتازیایەکی بێ بنەما بینراوە) تەنیا بەو دواییانە زاراوەیەکی پۆلێنبەندی . لە ١٩٦٠کاندا، تەکنیکی نوێ هێنرانەکایەوە کە رێگەی بە دکتۆرەکاندا تا ئەو نەخۆشانە بێننەوە سەر ژیان کە تووشی جەڵتەی دڵ دەبوون. ئەو نەخۆشانەی کە لە سەردەمانی پێشوودا لەوانەیە بمردنایە، ئێستا ئیتر دەهێنرانەوە سەر زەمینی ژیان. ئەم پزیشکانە، بێ ئەوەی ئاگادار بن، بە هەوڵە رزگارکەرەکانیانەوە، جۆرێکی گەشتیاری ئەودیو زەمینییان بەرهەم دەهێنا: ئەوانەی کە ئەودیوی پەردەکەیان دەبینی و دەگەڕانەوە تا بیگێڕنەوە. ئەمڕۆکە ژمارەیان ملیۆنەهایە. پاشان لە ١٩٧٥دا، خوێندکارێکی پزیشکی بەناو (رەیمۆند مودی) کتێبێکی بڵاو کردەوە بەناوی (ژیان پاش ژیان) کە تیایدا باسی ئەزموونی پیاوێك دەکات بەناوی (جۆرج ریچی). ریچی لە ئەنجامی جەڵتەی دڵ مردبوو دوای ئەوەی تووشی نەخۆشی سییەکانی ببوو و بۆ ماوەی نۆ خولەك چووبووە دەرەوەی جەستەیەوە. ئەو بە تونێلێکدا رۆیشتبوو، سەردانی

ناوچە بەهەشتی و دۆزەخییەکانی کردبوو، بوونەوەرێکی لە رووناکی بینیبوو کە ئەو پێی وابووە عیسایە و هەستی ئارامی و باشبوونی ئەزموون کردبوو بە شێوازێکی ئەوەندە چڕوپڕ کە نەیدەتووانی بیخاتە ناو وشەکانەوە. سەردەمی ئەزموونی نزیکە مەرگی مۆدێرن لەدایك بوو.

ناتوانم بڵێم بە تەواوی لە کتێبەکەی مودی بێئاگا بووم، بەڵام بە دڵنیاییەوە قەت نەمخوێندووەتەوە. پێویستم بەوە نەبوو چونکە، پێش هەموو شتێك دەمزانی کە ئەمە جەڵتەی دڵ نیشانەی هەلومەرجی نزیکە مەرگە، بێ مانایە. بەشی زۆری ئەدەبیاتی ئەزموونی نزیکە مەرگ پەیوەندی بەو نەخۆشانەوە هەیە کە دڵیان بۆ چەند خولەکێك وەستاوە– بەزۆری پاش رووداوێك یان لەسەر مێزی نەشتەرگەری. بیرۆکەی ئەمەی کە جەڵتەی دڵ مردنە نزیکەی پەنجا ساڵێکە بەسەرچووە. زۆرێك لە خەڵکی ئاسایی هێشتا بڕوایان وایە کە ئەگەر کەسێك لە جەڵتەی دڵ هەڵسێتەوە ئەوا "مردووە" و گەڕاوەتەوە بۆ ژیان، بەڵام کۆڕی پزیشکی ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر چاوخی خشاندەوە بە پێناسەکانیدا بۆ مەرگ و پەیوەستی کردەوە بۆ مێشك نەك دڵ (لەو کاتەوە پێوەری مەرگی مێشك بونیاد نرا کە بەندە بە ئەنجامگیرییە گرنگەکانی پشکنینی دەمارناسیی نەخۆشەکە). جەڵتەی دڵ تەنیا لەو ڕووەوە پەیوەندی بە مەرگەوە هەیە کە کار بکاتە سەر مێشك. لە ماوەی چەند چرکەیەکی جەڵتەی دڵدا، وەستانی خوێن بەرەو مێشك دەبێتەهۆی پچڕانی بەرفراوانی چالاکیی دەماریی هەماهەنگ و نەمانی ئاگایی.

بۆ ماوەی نیوسەدە، نەشتەرگەران بەشێوەیەکی رۆتینی بۆ ماوەی چەند خولەك و چەند سەعات لە نەشتەرگەریی دڵدا دڵیان وەستاندووە و ناوبەناو نەشتەرگەریی دەمار و مێشك، بە بەکارهێنانی پەمپەکانی ئۆکسجین و هەندێ جار هێورکردنەوەی

مێشك بۆئەوەی لە ژێر ئەو فشارانەدا کرداریبوونی پەرەپێبدات. هیچ مردنێکی مێشك رووینادات. تەنانەت ئەو کەسەش کە لەسەر جادە دەمرێت لەوانەیە لە زیانی مێشك بپارێزرێت بەو مەرجەی کە کەسێك لەماوەی چوار خولەکدا هەناسەدانی دەستکردی بۆ بکات و دڵ دواجار دەتوانێ دەست بە ئیش بکاتەوە. تا ئەو کاتەی کە خوێنی ئۆکسجیناوی بۆ مێشك دەچێت- ئەوا مێشك و بۆیە کەسەکە- زیندوو دەبێ، هەڵبەت بەشێوەیەکی کاتی بێ هۆش دەبێت.

ئەم برە زانیارییە هەموو ئەو شتە بوو کە پێویستم بوو بۆ کەم نرخکردنی کتێبەکەی (مودی) بەبێ ئەوەی بیکەمەوە. بەڵام ئێستا ئیتر کردمەوە و خوێندنەوەی ئەو بەسەرهاتانەی کە مودی باسی کردبوون و بە ئاگاداربوون لەوەی کە خۆم پیایدا تێپەڕیبووم، وایلێکردم روانگەم بە تواوی بگۆڕێت. گومانێکی وەهام نەبوو کە لانی کەم هەندێ لەو خەڵکانەی ناو ئەو بەسەرهاتانە بەشێوەیەکی راستەقینە جەستە فیزیکییەکانیان جێهێشتووە. هاوشێوەییەکان لەگەڵ ئەوەی کە خۆم لەسەروو جەستەوە ئەزموونم کردبوو زۆر سەرسوڕهێن بوون.

بەشە بەراییەکانی مێشکم- بەشە کەیبانووەکان- تەواوی یان زۆربەی ماوەی کۆماکەم ئیشیان دەکرد. بەڵام هەرچی پەیوەندی بەو بەشەوە هەیە کە هەر زانایەکی مێشك پێت دەڵێت بەرپرسە لە لایەنە مرۆڤییەکەی من: نەمابوو. دەمتووانی لەسەر ئەشیعەکان، لە ژمارەکانی تاقیگەکان، لە پشکنینە دەمارناسییەکانمدا ببینم- لە هەموو ئەو داتایەدا کە ئەو هەفتەیە بە وردی تۆمار کرابوو کە لە نەخۆشخانە بووم. بە خێرایی درکم بەوە کرد کە بەسەرهاتی من لە رووی تەکنیکییەوە ئەزموونێکی نزیکە مەرگی کامڵ بوو، لەوانەشە یەکێك لە هەرە قەناعەتهێنترینی ئەو کەیسانە بێت لە مێژووی مۆدێرندا. ئەوەی کە بە راستی

لەبارەی کەیسەکەی منەوە گرنگ بوو ئەوە نەبوو کە بەشێوەیەکی کەسی بەسەرم هات، بەڵکو مەحاڵیەتی بێ چەندوچونی مشتومڕ کردن بوو لە روانگەی پزیشکییەوە کە ئەمە هەمووی خەیاڵ بوو بێت.

وەسفکردنی ئەمەی کە ئەزموونی نزیکە مەرگ چۆنە، لە باشترین حاڵەتدا، پڕکێشەیە، بەڵام ئەم وەسفکردنە بۆ پیشەیەکی پزیشکی کە رەتی دەکاتەوە باوەڕ بێنێت شتی وا هەیە، قورستری دەکات. بەهۆی پیشەکەمەوە لە بواری زانستی دەمار و ئەزموونی نزیکەمەرگی خۆم، ئێستا ئیتر هەلێکی ناوازەم هەبوو تا سازگارتری بکەم.

بەشی سێ

# گەڕانەوە لەناو مردووانەوە

نزیك كەوتنەوە لە مەرگ، بە دوایین دەركەوتن بەشێوەی یەكسان كاریگەری دەخاتەسەر هەمووان كە تەنیا نووسەرێكی گەڕاوە لەناو مردووانەوە دەتوانێ بایی پێویست بیگێڕێتەوە.

هێرمان مێلڤیل (١٨١٩-١٨٩١)

لەو چەند هەفتەیەی یەكەمدا بۆ هەركوێیەك بچوومایە، خەڵكی وەها سەیریان دەكردم وەك بڵێی لە گۆڕ راست بوومەتەوە. چوومە لای دكتۆرێك كە ئەو رۆژەی داخڵی نەخۆشخانە كرابووم لەوێ بوو. راستەوخۆ نەهاتبووەناو ئیشی چاودێریی منەوە، بەڵام تا ئاستێكی باش ئاگادار بوو كاتێك ئەو بەیانییە بردمیانە ژووری ئێمێرجێنسی.

ئەو بە كورتكردنەوەی پرسیارە بنچینەییەكەی كۆڕی پزیشكی لەبارەی منەوە پرسیاری كرد "چۆن دەشێ تۆ تەنانەت لێرە بیت؟ تۆ برا جمكەكەی ئێبێنیت یان چی؟ "

من بزەیەکم هات، دەستم درێژ کرد و تەوقەیەکی گەرمم لەگەڵیدا کرد بۆئەوەی پیشانی بدەم بە راستی منم.

هەرچەندە ئەو گاڵتەی دەکرد لە پرسیاری ئەوەدا ئاخۆ من برایەکی جمکم هەیە، ئەم دکتۆرە بە راستی خاڵێکی گرنگی دەخستەڕوو. بە هەرچی نیاز و مەبەستێکە، من دوو کەس بووم و ئەگەر قەرار بووایە کە ئەوە بە ئێبێن بڵێم کە خۆم دەمەوێ– ئەزموونی خۆم بەکاربێنم بۆ یارمەتیدانی ئەوانیتر– ئەوا دەبووایە ئەزموونی نزیکە مەرگی خۆم لەگەڵ تێگەیشتنی زانستیم ئاشت بکەمەوە و ئەو دوو کەسە بەیەکەوە گرێ بدەم.

یادەوەریم چووەوە سەر ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنەی کە پێش چەند ساڵێك بۆم هات، لە دایکی ئەو نەخۆشەوە کە تەلەفۆنی کرد لەکاتێکدا کە من نەخشەیەکی دیجیتاڵیی وەرەمێکم دەپشکنی کە دەبووایە کاتێکی دواتری ئەو رۆژە لایببەم. گریمان ئەو ژنە ناوی سوزانا بوو. مێردی کۆچکردووی سوزانا، کە من لێرە بە جۆرج ناوی دەبەم، نەخۆشێکی من بوو کە مێشکی وەرەمی تیا بوو. سەرباری هەموو ئەو شتانەی کە کردمان، لەماوەی ساڵ و نیوێکی نەخۆشییەکەدا مرد. ئێستاش کچی سوزانا تووشی چەند پنتێکی تەشەنەی وەرەمی مێشك بوو لە ئەنجامی شێرپەنجەی مەمکدا. ئاسۆکانی بەردەمی بۆ مانەوە لە ژیاندا بۆ چەند مانگێك ئەستەم بوو. کاتێکی باش نەبوو بۆ ئەوەی تەلەفۆن هەڵگرم– هۆشم بەتەواوی رۆچووبووە ناو وێنە دیجیتاڵییەکەی بەردەمم لەگەڵ پلاندانانی ئەمەی کە بچم ئەو پنتە تەشەنەکردووە لاببەم بێ ئەوەی زیان بە شانەی مێشکی دەوروبەری بگەیەنم. بەڵام من لەگەڵ سوزانا لەسەر هێڵ مامەوە چونکە دەمزانی هەوڵدەدات بیر لە شتێك بکاتەوە– هەر شتێك– بۆئەوەی خۆی لەگەڵ دۆخەکە بگونجێنێت.

من هەمیشە بڕوام وابووە کە کاتێك لەژێر فاری نەخۆشییەکی کوشندەدایت، نەرمکردنەوەی ڕاستییەکە ئاساییە. بەرگرتن لەوەی نەخۆشێکی ڕوولەمەرگ هەوڵ بدات مەودای خەیاڵێکی بچوك لای خۆی بهێڵێتەوە بۆ یارمەتیدانی خۆی تا دەست و پەنجە لەگەڵ ئەگەری مردندا نەرم بکات وەکو ئەوە وایە دەرمانی ئازارشکێن بەلاوە نێیت. ئەمە بارێکی بێ ڕادە قورس بوو و دەبووایە من هەموو هۆشێکی خۆم بە سوزانا بسپێرم.

سوزانا وتی "دکتۆر، کچەکەم خەونێکی تا بلێی سەیری بینیووە. باوکی هاتووەتە لای. پێی وتووە کە هەموو شتێ لە باشیدا دەبێ و پێویست ناکات لە مردن نیگەران بێت".

ئەمە شتێکە کە چەندەها جار لە نەخۆشەکانەوە بیستوومە– ئەقڵ هەموو شتێك کە بتوانێ دەیکات بۆ هێورکردنەوەی خۆی لە بارودۆخێکی بێ سنوور ئازاربەخشدا. پێم وت کە ئەمە خەونێکی جوانە.

"بەلام دکتۆر لەهەمووی سەیرتر، ئەو جلانە بوون کە لەبەریدابوون. قەمیسێکی زەرد– و کلاوێکی نزمی لێوار نەرمی لەسەر بووە ! "

بە ڕووخۆشییەوە وتم "باشە سوزانا. پێم وایە لە بەهەشت جل و بەرگ یاسا و ڕێسایان بۆ نییە".

سوزانا وتی "نا دکتۆر. وەها نییە. لە سەرەتاکانی پەیوەندیماندا کە تازە ژوانمان دەبەست، من قەمیسێکی زەردم دایە جۆرج. حەزی دەکرد لەگەڵ کلاوێکی نزمی لێوار نەرم بیپۆشێت کە ئەویشم پێ بەخشیبوو. بەلام ئەو قەمیس و کلاوە بزر بوون کاتێك پرێسکەکەمان لە مانگی هەنگوینیمان نەگەیشت. بە هاتنی ئەو

کاتە ئیتر دەیزانی کە من چەنێك بە کڵاو و قەمیسەیەوە خۆشم دەوێ، بەڵام ئێمە هەرگیز نەمانگۆڕین بە شتێکی تر".

وتم "سوزانا، من دڵنیام کە کریستینا چیرۆکی خۆشی لەبارەی ئەو قەمیس و کڵاوەوە بیستووە. هەروەها لەبارەی ئەو کاتانەی سەرەتا کە لەگەڵ مێردەکەت بەیەکەوە بوون. . . "

پێکەنی و وتی "نا. ئەمەیە کە سەیرە. ئەمە نهێنییە بچوکەکەمان بوو. دەمانزانی کە بەلای هەر کەسێکی ترەوە پڕوپوچ دەردەکەوێ. ئێمە قەت باسی ئەو قەمیس و کڵاوەمان نەکردەوە دوای ئەوەی کە بزر بوون. کریستینا قەت هیچی لەبارەیانەوە لە ئێمە نەبیست. کریستینا زۆر لە مردن دەترسا و ئێستا دەزانێ کە هیچ شتێ نییە لێی بترسێت، هیچ شتێك".

لە خوێندنەوەکەمدا بۆم دەرکەوت کە ئەوەی سوزانا پێی دەوتم، یەکێکە لەو چەندەها جەختکردنەوانەی خەون کە زۆرجار روودەدات. بەڵام کاتێك ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنییەم بۆ هات بە ئەزموونی نزیکەمەرگدا تێنەپەڕیبووم و ئەو کاتە بە باشی دەمزانی کە ئەوەی سوزانا دەیڵێت خەیاڵێکی سەرچاوەگرتوو لە خەم و خەفەتە. پێ بە پێی ژیانی پیشەییم، چەندەها کەسم لەو نەخۆشانە چارەسەر کردبوون کە بە ئەزموونی نائاساییدا رەت ببوون کاتێك لە کۆمادابوون یان لەماوەی نەشتەرگەریدا. هەرکاتێك کە یەکێك لەو کەسانە ئەزموونێکی نائاسایی وەکو سوزانای دەگێڕایەوە، هەمیشە لەگەڵیدا هاوهەست دەبووم. و بە تەواوی دڵنیابووم کە ئەو ئەزموونانە بە راستی روویانداوە— لە هۆشی خۆیاندا. مێشك ئاڵۆزترین—و چاوەڕواننەکراوترین— ئۆرگانە کە هەمانە. دەستکارییەکی بکە، تا چەند یەکەیەکی پەستان ئاستی ئەو ئۆکسجینەی لێ کەم بکەرەوە کە

وەریدەگرێت، ئیتجا خاوەنەکەی گۆڕانکارییەك لە واقیعدا بەدی دەکات. یان بەشێوەیەکی دەقادەقتر، گۆڕانکارییەك لە ئەزموونی کەسییان بۆ واقیع بەدی دەکەن. هەموو ئەو برینە جەستەیی و دەرمانەش لەبەرچاو بگرە کە لەوانەیە کەسێك بەهۆی نەخۆشی مێشکەوە هەیبێت، ئەگەر نەخۆشەکە هیچ یادەوەرییەکی هەبوو کاتێك دەگەڕێتەوە، ئەوا تۆ تەقریبەن گەرەنتیی ئەوە وەربگرە کە ئەو یادەوەرییانە بە تەواوی نائاسایی دەبن. ئەگەر مێشك بەکتریایەکی کوشندە لێی دابێت و دەرمانی وەرچەرخێنەری ئەقڵ لەکایەدا بن، هەر شتێك دەشێ ڕوویدات. هەر شتێك– جگە لەو ئەزموونە سەروو واقیعەی من لە کۆماکەمدا بەسەرم هات.

بەو جۆرە سەرسامییە کە لەکاتێکدا دێت کە تۆ شتێك دەبینیت کە دەبووایە روون بووایە، درکم بەوە کرد کەئەو رۆژە سوزانا بۆ ئەوە تەلەفۆنی نەکردووە کە ئاسودەیی پێ بدەم. ئەو بە راستی و واقیعی هەوڵی داوە دڵنەوایی بە من بدات. بەڵام من نەمتووانی ئەوە ببینم. من پێم وابوو کە چاکەیەك لەگەڵ سوزانا دەکەم کاتێك بە شێوازە خەیاڵ پەرتبووە لاوازەکەم وامدەردەخست کە بڕوا بە بە چیرۆکەکەی دەکەم. بەڵام باوەڕم نەدەکرد. بە ئاوڕدانەوەش لەو وتوێژە و دەیانی تری وەکو ئەمە، درکم بەوە کرد کە چ رێگایەکی درێژم لەبەردەمدایە ئەگەر نیازم بێ قەناعەت بە دکتۆرە هاوەڵەکانم بێنم لەمەڕ ئەوەی کە ئەوەی پیایدا تێپەڕیووم واقعییە.

## بەشی سی و یەك

# سێ کەمپ

من پێداگری دەکەم لەسەر ئەوەی کە ڕازی مرۆیی بەشێوەیەکی بێ هاوتا بەهۆی ڕێبازی بچووککردنەوەی زانستییەوە بێنرخ کراوە، بەو بانگەشەیەی کە مەتریالیزمی مژدەبەخش دواجار جیهانی ڕۆحی لە سۆنگەی ڕێساکانی چالاکیی دەمارییەوە روون دەکاتەوە. دەبێ ئەم بڕوایە وەکو خورافیات پۆلێن بکرێت. . . دەبێ ئەوە بزانین کە ئێمە بوونەوەری ڕۆحین کە بە گیانەوە لە جیهانێکی ڕۆحیدا هەروەها بوونەوەری ماددین بە جەستە و مێشکەوە لە جیهانی ماددیدا.

سێر جۆن ئێکلس (١٩٠٣–١٩٩٧)

کاتێك قسە دێتە سەر ئەزموونەکانی نزیکە مەرگ، سێ کەمپی بنچینەیی بوونیان هەیە. باوەڕدار هەبوون: چ ئەو خەڵکەی کە خۆیان بە ئەزموونەکانی نزیکە مەرگدا ڕۆیشتبوون یان تەنیا ئەو ئەزموونەیان هەروا بە ئاسانی قبوڵ دەکرد. پاشان، بێگومان، بێباوەڕی توند هەبوون (وەکو منی پێشوو). لەگەڵ ئەوەشدا ئەم خەڵکانە بەشێوەیەکی گشتی خۆیان وەکو بێباوەڕ پۆلێن نەدەکرد. ئەوان تەنیا "دەیانزانی" کە مێشك ئاگایی بەرهەم دێنێت و دەستەمۆ نییە بۆ ئایدیای شێتانەی ئەقڵ لەودیو جەستەوە (مەگەر ئەوەی کە خۆش مەشرەبانە دڵنەواییدەری کەسێك بن، هەروەکو چۆن من ئەو ڕۆژە ئەمەم لەبەرانبەر سوزانا دەکرد).

پاشان گرووپی ناوەڕاست هەبوو. لێرەدا هەموو ئەو جۆرە خەڵکانە هەبوون کە لەبارەی ئەزموونەکانی نزیکە مەرگەوە بیستبوویان، چ بە خوێندنەوە لەبارەیانەوە- چونکە بەشێوەیەکی سەرووئاسایی باون- لە ڕێگەی هاوڕێیەك یان خزمێکەوە کە بەسەری هاتووە. ئەم خەڵکانەی ناوەڕاست ئەوانە بوون کە دەشێ بەسەرهاتەکەم بە راستی یارمەتیدەر بێ بۆیان. ئەو هەواڵەی کە ئەزموونەکانی نزیکە مەرگ لەگەڵ خۆیاندا دەیهێنن وەرچەرخێنەری ژیانە. بەڵام کاتێك کەسێك کە تا رادەیەکی زۆر کراوەیە لەبەرانبەر ئەزموونێکی نزیکە مەرگ پرسیار لە دکتۆر یان زانایەك دەکات- لە کۆمەڵگەی ئێمەدا دەرگاوانەکانی مەسەلەی ئەوەی کە چ واقعییە و چ واقعی نییە- ئەوان هەموویان زۆربەی کات، بە نەرمی بەڵام بە پێداگرییەوە پێیان دەوترێت کە ئەزموونەکانی نزیکە مەرگ خەیاڵپڵاوین: بەرهەمی مێشکێکن کە لە ململانێدایە بۆ مانەوە لە ژیاندا و هیچی تر.

وەکو دکتۆرێك کە بەو دۆخەدا تێپەڕیووە، دەمتوانی بەسەرهاتێکی جیاواز باس بکەم. چەندەی زۆریش بیرم لێبکردایەتەوە، ئەوەندە زیاتر هەستم دەکرد ئەرکێکم لە ئەستۆیە بۆ ئەم کارە.

یەك بە یەك، بەو پێشنیارانەدا رۆیشتم کە دەمزانی هاوکارەکانم و خۆشم لە رۆژانی کۆندا، دەیانخستەڕوو بۆ "روونکردنەوە"ی ئەمەی کە بەسەر مندا هاتووە.

ئایا ئەزموونی من پرۆگرامێکی بەشی بەرایی خوارەوەی مێشك بوو کە گەشەی کردبوو بۆئەوەی ئێش و ئازاری کوشندە هێور بکاتەوە- بۆ نموونە لەوانەیە پاشەواری ئەو ستراتیژییانەی "خۆ کردن بە مردوو" کە شیردەرەکانی ئاستی خوارەوە بەکاریان دەهێنا؟ ئەمەم رێك و ڕەوان بە پوچ لەقەڵەمدا. مەحاڵ بوو کە

ئەزموونەکانم، بەو هەموو ئاستە دیدەنی و بیستەنییە ئالۆزکاوییە و ئاستی بالآی مانای درککراویان، بەرهەمی بەشی خشۆک ئاسای مێشکم بێت.

ئایا ئەمە بەیادهاتنەوەیەکی شێواوی مانای درککراو بوو لە بەشە قووڵەکانی سیستەمی هەستیم، ئەو بەشەی مێشك کە وەرگرتنی هەستییانە (تووڕەیی، ترس، غەریزە، . . . ) دەوروژێنێت؟ جارێکی تر، نا- بەبێ نیۆکۆرتێکسێکی چالاك، سیستەمی هەستەکان ناتوانێ ئەو دیمەنانە بەو ڕۆشنی و لۆجیکەی من ئەزموونم کرد بەرهەم بێنێت.

دەشێ ئەزموونی من جۆرێك بووبێت لە دیمەنی وەهمی بەهۆی هەندێ (زۆرێك) لەو دەرمانانەی ئەمدرایە؟ جارێکی تر، هەموو ئەو دەرمانانە بەهۆی ئامرازە وەرگرەکانی نیۆکۆرتێکس ئیش دەکەن. ئەگەر نیۆکۆرتێکس ئیش نەکات، هیچ ڕووبەرێك نییە ئەم دەرمانانە ئیشی لەسەر بکەن.

ئەی چاو جولآنەوەی بێ ویست؟ ئەمە ناوی دۆخێکی فیزیکییە (پەیوەندی بە جوڵەی خێرای چاوەوە هەیە قۆناغێك کە تیایدا خەو بینین ڕوودەدات) تیایدا نیۆرۆترانزمیتەر* ە سروشتییەکانی وەکو (سێرۆتۆنین) کارلێك دەکەن لەگەڵ ئامرازە وەرگرەکان لە نیۆکۆرتێکسدا. دووبارە ببوورن. چاوجولآنەوەی بێ ویست پێویستی بە نیۆرۆکۆرتێکسێکی ئیشکەر هەیە بۆئەوەی ڕووبدات و من نەمبوو.

پاشان دیاردەیەکی گریمانەیی هەبوو بەناوی "دی ئێم تی دەمپ". لەم حاڵەتەدا، غودەی سنەوبەری، بە کاردانەوە بەرانبەر فشاری هەڕەشەیەکی گریمانەیی لەبەرانبەر مێشکدا، ماددەیەك بەرهەم دێنێت بەناوی (دی ئێم تی). دی ئێم تی، لە بونیاد دا هاوشێوەیە لەگەڵ سێرۆتۆنین و دەشێ دۆخێکی شت

---

* ئەنزلکەی کیمیایی کە پەیام لە دەمارەخانەیەکەوە بۆ دەمارەخانەیەکی تر دەگوازنەوە.

هاتنەبەرچاوی لە رادەبەدەر توند لەگەڵ خۆیدا بێنێت. من هیچ ئەزموونێکی کەسیم لەگەڵ دی ئێم تی-دا نەبووە و هێشتا نیمە- بەڵام هیچ مشتومڕێکیشم نییە لەگەڵ ئەوانەی کە دەڵێن دەشێ ئەزموونێکی شت هاتنەبەرچاوی بەهێز بەرهەم بێنێت، لەوانەیە ئەزموونێکی وەها کە دلالاتی راستەقینەی هەیە بۆ تێگەیشتنمان لەوەی کە ئاگایی و واقیع بە راستی چۆنن.

لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا ئەوە راستییەکە کە ئەو بەشەی دی ئێم تی کاری تێدەکات (نیۆکۆرتێکس) لە حاڵەتی مندا بوونی نەبوو تا کاری تێبکرێت. بۆیە لە سۆنگەی "روونکردنەوە"ی ئەوەی کە من چیم بەسەر هات، گریمانەی (دی ئێم تی دەمپ) هەروەکو روونکردنەوە ئەگەرییەکانی تر و لەبەر هەمان هۆکار لە بنەڕەتەوە کورتی هێنا. ئەو دەرمان و ماددانەی تەوەهوم دروست دەکەن کار دەکەنە سەر نیۆکۆرتێکس و نیۆکۆرتێکسی من لەوێ نەبوو تا کاریگەری بکەوێتە سەر.

دوایین گریمانە کە من لێم روانی، پەیوەندی هەبوو بە "دیاردەی ریبوت". ئەمە وەها ئەزموونی من روون دەکاتەوە کە کۆمەڵەیەك بیرۆکە و یادەوەرییە لە جەوهەردا هەڵوەشاوی جێماوە پێش ئەوەی کۆرتێکسم بە تەواوی لەکار بکەوێت. وەکو چۆن کۆمپیوتەرێك ریستارت دەکرێت و ئەوەی کە لە تواناییدا بێت لە دواییدا خەزنی دەکات پاش ئەوەی تووشی گرفتێکی سەرانسەریی سیستەم دەبێت، مێشکم ئەو پارچانەی ئەزموونەکەمی لەو برە جێماوانە پێکەوەلکاندووەتەوە ئەوەندەی کە توانیبێتی. لەوانەیە ئەمە بە ریستارتکردنی کۆرتێکس بۆ ناو ئاگایی رووبدات پاش ئەوەی گرفتێکی سەرانسەریی سیستەم دروست دەبێت، هەروەکو لە مێنێنجایتسی تەشەنەکردووی مندا. بەڵام ئەمە لاوازترین ئەگەرە بە لەبەرچاوگرتنی ئاڵۆزکاوی و کارلێکی یادەوەرییە پڕ وردەکارییەکانم. لەبەرئەوەی من سروشتێکی

ناڕاستەهێڵیی زەمەنم لە جیهانی ڕۆحیدا زۆر بە چڕوپڕی ئەزموون کرد، ئێستا دەتووانم لەوە تێبگەم کە بۆچی نووسینی زۆر لەسەر ڕەهەندی ڕۆحی دەشێ لە ڕوانگەی زەمینیمانەوە شێواو یان تەنیا پوچ دیار بێ. لە جیهانەکانی سەروو ئەمەوە، کات بەو شێوەیەی ئێرە ناڕوات. مەرج نییە شتەکان لەو جیهانانەدا یەك لەدوای یەك بن. دەشێ چرکەیەك وەکو تەمەنێك دیار بێ و یەك یان چەندەها تەمەن وەکو چرکەیەك دەرکەون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە کات لەو جیهانانەی سەرەوەدا (بەو پێوەرانەی ئێمە) بەشێوەیەکی ئاسایی ڕەفتار ناکات، بەو مانایە نییە کە پەرپوتە و یادەوەرییەکانی من لەو کاتەم لە کۆمادا ڕاستی ئەوە دەردەخات. بە قسەکردن لە سۆنگەی زەمەنەوە، هیوابەخشترینی ئەم جیهانەم، کارلێکم بوو لەگەڵ سوزان ڕێینتجێس کاتێك لە شەوی چوارەم و پێنجەمدا پەیوەندی پێوە کردم و دەرکەوتنی ئەو شەش ڕوخسارە بوو لە کۆتاییەکانی گەشتەکەمدا. لەوانەیە تۆ بڵێیت هەر دەرکەوتنێکی تری هەماهەنگیی زەمەنی لەنێوان ڕووداوەکانی سەر زەوی و گەشتەکەی دەرەوەم تەنیا بۆچوون بێت!

چەندەی لە هەلومەرجەکەم فێر بووم و چەندەی بە بەکارهێنانی ئەدەبیاتی زانستیی هەنووکەیی سۆراخکارییم کرد بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە ڕوویدابوو، ئەوەندە زیاتر کورتم هێنا. هەموو شتێك– ڕوونیی بیناییم، ڕۆشنیی بیرکردنەوەکانم– گوزارشت بوون لە کارکردنی بەشی سەرەوە و خوارەوەی مێشك. بەڵام بەشی سەرەوەی مێشکم ئامادەیی نەبوو تا ئەو ئیشە بکات.

چەندەی زیاتر ڕوونکردنەوە "زانستییەکان"ی ئەزموونەکانی نزیکە مەرگم خوێندنەوە، ئەوەندەش زیاتر بە تەنکییە شەفافەکەیان شۆك دەبووم. لەگەڵ ئەوەشدا منیش بە خەمەوە دەمزانی کە ئەمانە کتومت ئەوانەن کە "من"ی پێشوو

بەشێوەیەکی تەمومژاوی ئامآژەی پێکردوون ئەگەر کەسێك پرسیاری لێبکردمایە تا بۆی "روون بکەمەوە" ئەزموونی نزیکە مەرگ چییە.

بەڵام ئەو خەڵکانەی کە دکتۆر نەبوون نەدەکرا ئەوەیان لێ چاوەڕێ بکرێ کە ئەمە بزانن. ئەگەر ئەوەی من پیایدا تێپەڕیم بەسەر یەکێکدا بهاتایە -هەرکەسێکی تر- ئەوا بایی پێویست مایەی سەرنج دەبوو. بەڵام لەبارێکدا کە بەسەر مندا هاتووە. . . وتنی ئەمەی کە لەبەر "هۆکارێك" بەسەرمدا هاتووە کەمێك شڵەژاندمی. بایی پێویست دکتۆرە کۆنەکەم هەر تیامابوو کە بزانێ ئەمە چەنێك سەیر- لە راستیدا چەنێك مەزن- دیارە. بەڵام کاتێك نائەگەریی زۆری هەموو ئەو وردەکارییەم ئیزافە کرد- و بەتایبەت کاتێك ئەوەم لەبەرچاو گرت کە مێنێنجایتسی ئی. کۆلای چەنێك نەخۆشییەکی تەواوە بۆئەوەی کۆرتێکسەکەم تێك بدات و چاکبوونەوەی خێرا و تەواوم لە تەقریبەن دارمانێکی دڵنیا- دەبووایە ئەگەری ئەوە بە جددی وەربگرم کە بە واقیعی و بە راستی لەبەر هۆکارێك بەسەرم هاتووە.

ئەمە تەنیا وایلێکردم هەست بە لێپرسراوێتی بکەم بۆئەوەی بەسەرهاتەکەم بە راستی بگێڕمەوە.

من هەمیشە ئەوەم وەکو شانازییەك داناوە کە لە بوارەکەی خۆمدا لەگەڵ تازەترین ئەدەبیاتی پزیشکیدا بڕۆم و هەروەها هاوبەشی بکەم کاتێك شتێکی بەهادارم هەبێ ئیزافەی بکەم. ئەمەی کە لەم جیهانە دەرچووم و کەوتمە جیهانێکی ترەوە هەواڵ بوو- هەواڵی پزیشکیی راستەقینە- و ئێستاش کە گەڕاومەتەوە، نیازم نییە بێ نرخی بکەم. بە قسەکردن لە سۆنگەی پزیشکییەوە، ئەمەی کە من بە تەواوی چاك بوومەتەوە مەحاڵێکی بێ چەندوچون بێت، موعجیزەیەکی پزیشکییە. بەڵام چیرۆکە راستەقینەکە ئەوەیە کە من لە کوێ بووم و من نەك تەنیا

وەکو زانایەك و ڕێزگرێکی قووڵی میتۆدی زانستی بەڵکو وەکو شیفابەخشێکیش ئەرکم لەئەستۆیە ئەو بەسەرهاتە بگێڕمەوە. بەسەرهاتێك- بەسەرهاتێکی ڕاستەقینە- دەتووانێ ئەوەندەی دەرمان شیفابەخش بێت. سوزانا ئەوەی زانیبوو کاتێك ئەو ڕۆژە لە ئۆفیسەکەم تەلەفۆنی بۆ کردم. خۆشم ئەوەندە ئەزموونم کردبوو کاتێك خانەوادەی ڕاستەقینەم وەڵامیان دامەوە. ئەوەی کە بەسەر منیشدا هات هەواڵی شیفابەخش بوو. ئەبێ من چ جۆرە شیفابەخشێك بم کە نەیگێڕمەوە؟

کەمێك پاش دوو ساڵ لە گەڕانەوەم لە کۆما، سەردانی هاوکار و هاوڕێیەکی نزیکم کرد کە سەرۆکی یەکێك لە دامەزراوە ئەکادیمییە هەرە دیارەکانی زانستی دەمارە لە جیهاندا. من چەند دەیەیەکە جۆن (ناوی ڕاستەقینەی نییە) دەناسم و بە مرۆڤێکی بێ وێنە و زانایەکی نمرە یەکی دەزانم.

هەندێك لەو بەسەرهاتەی گەشتە ڕۆحییەکەم بۆ ناو قووڵایی کۆماکەم بۆ جۆن گێڕایەوە و ئەو تەواو سەری سوڕما. سەری نەسوڕما لەوەی کە ئێستا چەنێك شێتم، بەڵکو وەك بڵێی دواجار لە شتێك تێدەگات کە ماوەیەکی درێژ بوو گێژی کردبوو.

دەرکەوت کە نزیکەی پێش ساڵێك، باوکی جۆن لە کۆتایی پێنجەم ساڵی نەخۆشییەکەی نزیك دەبووەوە. ئازار ئەوی بێ توانا و دەروون ناساغ کردبوو و دەیویست بمرێت.

باوکی لەسەر پێخەف مەرگیەوە لە جۆن دەپاڕایەوە "تکایە، هەندێ حەب یان شتی ترم بەرێ. ناتوانم هەروا بەردەوام بم".

پاشان لەپڕ باوکی زۆر بەهێزتر و بەخۆوەتر بوو لە دوو ساڵی ڕابردوو کاتێك هەندێ لایەنی قووڵی ژیانی خۆی خانەوادەکەیانی باس کرد. پاشان چاوەکانی

وەرگێڕان و دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵ هەوای خوار پێخەفەکەی. بە گوێگرتن لێی، جۆن بۆی دەرکەوت کە باوکی لەگەڵ دایکی مردوویدا قسە دەکات کە پێش شەست و پێنج ساڵ مردبوو، کاتێك باوکی جۆن تەنیا هەرزەکارێك بوو. ئەو لەماوەی ژیانی جۆندا بە دەگمەن باسی کردووە بەڵام ئێستا وتوێژێکی زیندوو و شادی لەگەڵدا ئەنجام دەدات. جۆن نەیدەتوانی بیبینێت، بەڵام بە بەخێرهێنانەوەی رۆحی باوکی بۆماڵەوە، بەشێوەیەکی رەها قەناعەتی وابوو کە رۆحی لەوێیە.

پاش چەند خولەکێك لەمە، باوکی جۆن پشتی لەو کرد، نیگایەکی تەواو جیاواز لە چاوەکانیدا بوو. خەندەی لەسەر لێوان بوو و دیار بوو کە زۆر هێمنە، زۆر زیاتر لەوەی کە جۆن لەیادیەتی.

جۆن وتی "باوکە بخەوە. تەنیا لێگەڕێ بڕوات. ئاساییە".

باوکیشی هەر ئەمەی کرد. چاوەکانی لێکنا، بە دیمەنێکی ئارامیی تەواوە خەوی پیاکەوت. کاتێکی کورت دواتر مرد.

جۆن هەستیکرد دیداری نێوان باوکی و داپیرەی کۆچکردووی زۆر راستەقینەیە، بەڵام نەیزانی چی بکات چونکە وەکو دکتۆر، دەیزانی کە ئەم شتانە "مەحاڵ"ن. زۆر کەسی تر ئەو رۆشنییە سەرسوڕهێنەی ئەقڵیان بەدیکردووە کە زۆرجار بەسەر خەڵکی بەتەمەنی دەروون ناساغ دا دێت رێك پێش ئەوەی بمرن هەروەکو جۆن لە باوکیدا بەدیکردبوو (دیاردەیەك کە بە "ڕۆشنبینی کۆتایی" ناسراوە). روونکردنەوەیەکی دەمارناسییانە بۆئەمە نەبووە. پێدەچوو گوێبیستبوونی بەسەرهاتی من رێگەخۆشکەرێك بووبێت کە ئەو ئاواتەخواز بوو کەسێك پێی بدات: رێگەخۆشکەر بۆ بڕواهێنان بەوەی کە بەو دوو چاوانەی بینیوویەتی — زانینی

راستیی قووڵ و ئاسودەبەخش: ئەمەی کە خودی رۆحیی نەمرمان زۆر واقیعیترە لە هەر شتێك کە ئێمە لەم واقعییەتە فیزیکییەدا پەی پێدەبەین و پەیوەندییەکی ئیلاهی هەیە بە خۆشەویستیی بێ پایانی خالقەوە.

بەشی سی و دوو

# سەردان بۆ کڵێسا

تەنیا دوو ڕێگا هەن بۆنەوەی ژیانی خۆت بژیت. ڕێگایەك وەك بڵێی هیچ شتێك موعجیزە نییە. ڕێگایەکیش وەك بڵێی هەموو شتێك موعجیزەیە.

ئەلبێرت ئەنیشتاین (١٨٧٩-١٩٥٥)

من تاوەکو کانوونی یەکەمی ٢٠٠٨ نەچوومەوە بۆ کڵێسا، کاتێك هۆڵی بەکێشی کردم بەرەو سروتی دووەم ڕۆژی جەژنەکانی مەسیح. هێشتا لاواز بووم، هێشتا تۆزێك ناهاوسەنگ بووم و هێشتا کێشم کەم بوو. من و هۆڵی لە ڕیزی پێشەوە دانیشتین. مایکڵ سولیڤان سروتی ئەو ڕۆژەی بەڕێوەدەبرد و هاتە پێشەوە و پرسیاری کرد ئاخۆ من حەز دەکەم مۆمی دووەمی سروتەکە داگیرسێنم. نەمدەویست ئەمە بکەم، بەڵام هەرچۆنێك بێ کردم. هەستام و بە ئارامییەکی چاوەڕواننەکراوەوە چوومە پێشەوەی کڵێساکە.

یادەوەریم لە کاتی چوونە دەرەوەم لە جەستە هێشتا کرچ و کاڵ بوو و دەچوومە هەر شوێنێك کە پێشتر نەیدەتووانی زۆر بمجوڵێنیت، ئەو هونەر و مۆسیقایەم دەبینی و دەبیست کە هەمووی دەهێنامەوە یاد. نۆتەی بمە بمی شێوە سرودەکە خەمناکیی ناوچەی روانگەی چاوی کرمیان دەهێنایەوە یادم. پەنجەرەی شوشەی پەڵە پەڵە بە هەورەکانی و فریشتەکانیەوە جوانیی ئیلاهیی دەروازەکەیان دەهێنایەوە یاد. تابلۆیەکی عیسا کە نانی لەگەڵ شوێنەکەوتووانی ورد دەکرد بەسۆزیی چەقەکەی دەهێناوە یاد. لەرزیم کاتێك ئەو نیعمەتەی خۆشەویستی بێمەرجی ناکۆتای ئەویم هاتەوە یاد.

دواجار، تێگەیشتم کە ئایین بە راستی چییە. یان لانی کەم دەبووایە چی بێت. من تەنیا بڕوام بە خودا نەبوو، بەڵکو خودام دەناسی. کاتێك بەرەو میحراب جولآم بۆئەوەی بچمە پاڵ خوانەکەن فرمێسك بەسەر روومەتەکانمدا هاتنەخوار.

بەشی سی و سێ

# کۆتا گەمەی ئاگایی

ئەگەر تۆ سۆراخکەرێکی راستەقینەی حەقیقەت بیت، پێویستە لە ژیانتدا لانی کەم جارێك، هەتا بۆت دەکرێ، لە هەموو شتەکان گومان بکەیت.

رێنێ دیکارت (١٥٩٦-١٦٥٠)

دوو مانگی پێچوو تا پاتریی مەعریفەی دەمارناسیم گەڕایەوە بۆم. بۆ ساتێك بەلاوەنانی ئەو راستییە لەجەوهەردا موعجیزەئاسایەی کە بە ڕاستی گەڕایەوە (هێشتا کەیسەکەی من پێشینەیەکی پزیشکی نییە کە تیایدا مێشکێك لەژێر هێرشی درێژخایەنی توند لەلایەن بەکتریایەکی گرام نێگەتیڤی وەکو ئی. کۆلای هیچ شتێك بەو تەواوییە چاك بکاتەوە)، کاتێکیش کە گەڕایەوە، بەردەوام بووم لە ململانێ لەگەڵ ئەو راستییەی کە هەر شتێك کە لە چوار دەیەدا فێری ببووم لە توێژینەوە و کار لەبارەی مێشکی مرۆڤ، لەبارەی گەردوون و لەبارەی ئەمەی کە واقیع چییە ناکۆك بوو لەگەڵ ئەوەی کە لەماوەی ئەو حەوت رۆژەی کۆماکەم ئەزموونم کردبوو. کاتێك کەوتمە ناو کۆماکەوە، دکتۆرێکی عەلمانی بووم کە تەواوی ژیانی پیشەیی لە

هەندێ سەنگینترین دامەزراوەی توێژینەوە لە جیهاندا بەسەر بردبوو لە هەوڵی ئەوەدا کە لە پەیوەندییەکانی نێوان ئاگایی و مێشکی مرۆڤ تێبگەم. بەو مانایە نییە کە بڕوام بە ئاگایی نەبوو. تەنیا لە زۆربەی خەڵکی هۆشیارتر بوومەوە لەمەڕ نائەگەری میکانیکیی سەرسوڕهێنی ئەوەی کە سەربەخۆ بێ– بەهیچ شێوەیەك!

لە ١٩٢٠ەکاندا، فیزیاناس وێرنەر هایزنبێرگ( و دامەزرێنەرانی تری زانستی میکانیکی کوانتەم) دۆزینەوەیەکیان ئەنجامدا ئەوەندە سەیر بوو کە هێشتا جیهان بە تەواوی لەگەڵیدا نەسازاوە. لەکاتی چاودێریکردنی دیاردەی نیمچەگەردیلەییدا، مەحاڵە چاودێریکەر (واتە ئەو زانایەی کە تاقیکردنەوەکە ئەنجام دەدات) لەو شتە جیا بکەیتەوە کە چاودێری دەکرێت. لە جیهانی رۆژانەماندا، فەرامۆشکردنی ئەو راستییە ئاسانە. ئێمە گەردوون وەکو شوێنێکی پڕ لە شتە جوداکان دەبینین (مێزەکان و کورسییەکان، خەڵك و ڕووەکەکان) کە ناوبەناو لەگەڵ یەکتریدا کارلێك دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە جودایی دەمێننەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ئاستی نیمچەگەردیلەییدا ئەم گەردوونەی شتە جوداکان دەردەکەوێ کە سەرتاپا وەهمە. هەرچی پەیوەندی بە یەکجار یەکجار بچوکەوە هەیە، هەر شتێك لە گەردوونی فیزیکیدا تەواو رایەڵە بە هەر شتێکی ترەوە. لە راستیدا، بەهیچ شێوەیەك "شتەکان" لە جیهاندا بوونیان نییە، تەنیا لەرەلەری وزە و پەیوەندییەکان بوونیان هەیە.

دەبووایە مانای ئەمە روون بووایە، لەگەڵ ئەوەشدا بەلای زۆرێکەوە وەها نەبوو. ئەستەم بوو سۆراخی واقعی جەوهەریی گەردوون بکەیت بەبێ بەکارهێنانی ئاگایی. دوور لەوەی کە بەرهەمێکی لاوەکی پرۆسە فیزیکییەکان بێت (کە من پێش ئەزموونەکەم بیرم لێکردبووەوە)، ئاگایی نەك تەنیا زۆر واقیعی– بەڵکو لە راستیدا

زۆر واقیعیترە لە بەشەکەی تری بوونی فیزیکی و بە ئەگەرێکی زۆریش بنەمای هەموویەتی. بەڵام هیچ کام لەم تێگەیشتنانە هێشتا بە راستی نەخراونەتە ناو وێنەی واقیعی زانست. زۆرێك لە زاناکان هەوڵ دەدەن ئەمە بکەن، بەڵام لەبەرئەوەی هێشتا "تیۆرەی هەموو شتێك"ی یەکگرتوو بوونی نییە کە بتوانێ یاساکانی میکانیکی کوانتەم لێکبدات لەگەڵ ئەوانەی تیۆرەی رێژگەرایی بەجۆرێك کە دەست بکات بە گرتنەخۆی ئاگایی.

هەموو شتەکانی ناو گەردوونی فیزیکی لە گەردیلە پێکهاتوون. گەردیلەکان خۆیان پێکهاتوون لە پرۆتۆنەکان، ئەلیکترۆنەکان و نیوترۆنەکان. ئەمانەش، (هەروەکو فیزیاناسەکان لە سەرەتاکانی سەدەی بیستدا دۆزیانەوە) هەموویان برِگەن. برِگەکانیش پێکهاتوون لە. . . ، ئەوەی راستی بێت فیزیاناسەکان نازانن. بەڵام شتێك کە لەبارەی برِگەکانەوە دەیزانین ئەوەیە کە هەریەکەیان رایەڵە بە هەر دانەیەکی تر لە گەردووندا. ئەمانە هەموویان، لە قووڵترین ئاستدا، گرێبەندن بە یەکترییەوە.

پێش ئەزموونەکەم لە دەرەوەی جەستە، من بە شێوەیەکی گشتی بەئاگابووم لە ئایدیا زانستییە مۆدێرنەکان، بەڵام دوور و لاتەریك بوون. لەو جیهانەدا کە تیایدا ژیاوم و جوڵاوم– جیهانی ئۆتۆمبێلەکان و خانووەکان و مێزەکانی نەشتەرگەری و ئەو نەخۆشانەی کە مانەوە یان مردن تا رادەیەك پەیوەست بەوەی ئاخۆ بە سەرکەوتوویی نەشتەرگەریم بۆ کردن– ئەم راستییانەی لەمەرِ فیزیای نیمچە گەردیلەیی لێڵ بوون و لابرابوون. لەوانەیە راست بن، بەڵام پەیوەندییان بە واقیعی رۆژانەمەوە نەبوو.

بەڵام کاتێك جەستەی فیزیکیم جێهێشت، ڕاستەوخۆ ئەم ڕاستییانەم ئەزموون کرد. لە ڕاستیدا هەست بە دڵنیایی دەکەم کە ئەمە دەڵێم، لەکاتێکدا کە تەنانەت ئەو زاراوەیەم هەر نەدەزانی، لەکاتێکدا کە لە دەروازەکە و لە چەقەکە بووم، بە ڕاستی "زانستم ئەنجامدەدا". ئەو زانستەی کە بەند بوو بە ڕاستترین و ئاڵۆزکاوترین ئامراز بۆ ئەو توێژینەوە زانستییەی کە ئێمە هەمانە:
خودی ئاگایی.

چەندەی زیاتر چوومە قووڵاییەوە، ئەوەندە زیاتر قەناعەتم هات کە دۆزینەوەکەم تەنیا مایەی سەرنج و دراماتیکییە. (زانستی) بوو. پەیوەست بەوەی کە تۆ قسە لەگەڵ کێ دەکەیت، ئاگایی یان گەورەترین ڕازە کە ڕووبەڕووی توێژینەوەی زانستی دەبێتەوە یان شتێکی سەرتاپا ڕوون و سادەیە. ئەوەی کە مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە چۆن ژمارەیەکی زۆرتری زانایان پێیان وایە ئەوەی دووەمیانە. بۆ زۆرێك —لەوانەشە زۆربەیان– لە زاناکان، ئاگایی بە ڕاستی ئەوە ناهێنێت نیگەرانی بیت چونکە تەنیا بەرهەمێکی لاوەکیی پرۆسە فیزیاییەکانە. زۆرێك لە زاناکان زیاتریش دەڕۆن و دەڵێن ئاگایی نەك تەنیا دیاردەیەکی لاوەکییە، بەڵکو تەنانەت (واقیعی)یش نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لە پێشەنگانی دەمارناسیی ئاگایی و فەلسەفەی ئەقڵ، هاوڕا نین. بە درێژایی ئەو چەند دەیەی دوایی، ئەوان "کێشە سەختەکانی ئاگایی"یان ناسیووەتەوە. هەرچەندە بیرۆکەکە چەند دەیەیەك بوو لە تێکەڵبوونەوەی ئاقارە گشتییەکەدا بوو، ئەوە (دەیڤد چالمەرز) بوو کە لە کتێبە نایابەکەیدا لە ١٩٩٦ بەناوی (ئەقڵی بەئاگا) کە پێناسەی کرد. کێشە سەختەکە

پەیوەندیّ هەیە بە خودی بوونی ئەزموونی ئاگایی و دەکرێتە بەسەر ئەم پرسیارانەدا شیتالّ بکرێت:

ئاگایی چۆن لە کارکردنی مێشکی مرۆڤەوە سەرهەڵدەدات؟

چۆن پەیوەندی هەیە بەو رەفتارەوە کە لەگەڵیدایە؟

چۆن جیهانی درککراو پەیوەندی هەیە بە جیهانی واقعییەوە؟

کێشە سەختەکە ئەوەندە قورسە کە هەندیّ لە بیرمەندان وتوویانە وەڵامەکە لە دەرەوەی تەواوی "زانست"دایە. بەڵام ئەمەی کە دەکەوێتە دەرەوەی سنوورەکانی زانستی هەنووکەیی بەهیچ شێوەیەك دیاردەی ئاگایی سووك ناکات– لە راستیدا ئەمە نیشانەیەکە بۆ رۆڵی بیّ سنووری لە گەردووندا.

زاڵبوونی ئەو میتۆدە زانستییەی کە بە درێژایی چوارسەد ساڵی رابردوو تەنیا و تەنیا رەگی لە رووبەری فیزیکیدایە، کێشەیەکی گەورە دەخاتەڕوو: ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ ئەو رازە قووڵەی لە چەقی بووندایە لەدەستداوە– کە ئاگاییمانە. ئەمە (بەناوی جیاجیا و بە دەربڕینی لەلایەن جیهانبینی جیاجیاوە) لەلایەن ئایینەکانی پێش مۆدێرن بەباشی ناسراوە و گرنگی پێدراوە، بەڵام لەلای کەلتووری خۆرئاوایی عەلمانیمان بزرە لەکاتێکدا کە پەیتاپەیتا زیاتر عاشقی هێزی تەکنۆلۆژیا و زانستی مۆدێرن بووین.

بۆ هەموو ئەو سەرکەوتنانەی شارستانیەتی خۆرئاوا بەدەستی هێناون، جیهان باجێکی گەورەی داوە لە سۆنگەی پێکهاتەی هەرە گرنگی بوونەوە– رۆحی مرۆییمان. دیوی تاریکی تەکنۆلۆژیای باڵا– جەنگی مۆدێرن و خۆکوشتن و کوشتاری بیّ باکانە، ئافاتی رووبەرە شارنشینییەکان، کارەساتی ژینگەیی، گۆڕانی کارەساتباری ئاو و هەوا، بەجەمسەربوونی سامانە ئابوورییەکان– بایی پێویست

خراپە. لە هەمووی خراپتر، تەرکیزمان لەسەر بەرەوپێشچوونی خێرا لە زانست و تەکنۆلۆژیادا ئێمەی تا رادەیەك کەموکورت کردووە لە مانا و خۆشی و زانینی ئەمەی کە چۆن ژیانمان لەناو نەخشەی مەزنی بووندا بۆ تاهەتایە جێی دەبێتەوە.

پرسیار لەبارەی رۆح و ئەودیوی ژیان، زیندووبوونەوە، خوا و بەهەشت قورسە لە رێگەی ئامرازە زانستییە تەقلیدییەکانەوە، کە دەڵێن لەوانەیە ئەم شتانە بوونیان نەبێ. بەهەمان شێوە، دیاردەی ئاگایی درێژبووەوە، وەکو لابەلا بینین، هەستی شەشەم، شت جوڵاندن بە هێزی ئەقڵ، ئایندە خوێندنەوە، تەلەپاتی و درککردنی پێشوەخت، بەشێوەیەکی کاریگەر بەرەنگارن لەبەرانبەر لێ تێگەیشتنیان لە رێگەی لێکۆڵینەوەی زانستییە "ستاندارد"ەکان. پێش کۆماکەم، گومانم هەبوو لە راستبوونیان، بەشێوەیەکی سەرەکیش لەبەرئەوەی کە لە ئاستێکی قووڵدا ئەزموونم نەکردبوون و لەبەرئەوەی نەدەکرا بەشێوەی حازربەدەست لە رێگەی جیهانبینیی زانستی سادەکراوەوە روون بکرێنەوە.

وەکو زۆرێك لە گومانکەرە زانستخوازەکان، رەتم دەکردەوە تەنانەت چاو بەو داتایەشدا بخشێنم کە پەیوەندییان بە پرسەکانی ئەم دیاردانەوە هەیە. هەر لە پێشدا حوکمم لەسەر داتایەکە و سەرچاوەکانی دەدا، چونکە روانگەی سنووردارم نەیدەتوانی تەمومژاویترین بیرۆکەش لەبارەی ئەمەوە دابین بکات کە دەبێ ئەو شتانە بە راستی چۆن روودەن. ئەوانەی پێداگری دەکەن لەمەڕ ئەوەی کە بەڵگە نییە بۆ دیاردەی پیشاندەری ئاگایی درێژبووەوە، سەرباری بەڵگەی زۆری پێچەوانەی ئەو قسەیە، بە ئەنقەست خۆیان نەزان دەکەن. ئەوان پێیان وایە کە راستییەکە دەزانن بێ ئەوەی بڕواننە راستییەکان.

بۆ ئەوانەی کە هێشتا لە داوی گومانگەرایی زانستیدا ماونەتەوە، پێشنیار دەکەم کتێبی (ئەقڵی سادە نەکراوە: بەرەو دەروونناسییەکی سەدەی بیست و یەك) کە لە ساڵی ٢٠٠٧دا چاپ کراوە. بەڵگەی ئاگایی دەرەوەی جەستە لەم شیکردنەوە زانستییە بێ وێنەیەدا بە باشی خراوەتەڕوو. (ئەقڵی سادە نەکراوە) بەرهەمێکی گەورەی گروپێکی سەنگین و ناسراوە بەناوی (گروپی توێژینەوە ئیدراکییەکان) کە شوێنەکەی لە زانکۆی ڤێرجینیایە. نووسەران چاوخشاندنێکی چڕوپڕیان بۆ داتای پەیوەندیدار ئەنجام داوە و ئەنجامگیرییەکە بێ چەندوچونە: ئەم دیاردانە واقعین و پێویستە ئێمە هەوڵ بدەین لە سروشتەکەیان تێبگەین ئەگەر دەمانەوێ لە واقیعی بوونمان تێبگەین.

ئێمە فریو دراوین بۆ ناو ئەو بیرکردنەوەیە زانستییەی کە جیهانبینیی زانستی بە خێرایی لە (تیۆرەی هەموو شتێك) نزیك دەبێتەوە کە پێناچێ بەشی پێویست بوار بۆ ڕۆحمان، گیانمان یان بۆ ئاسمان و خودا بهێڵێتەوە. گەشتەکەم بۆ ناو قووڵایی کۆما، بۆ دەرەوەی ئەم پانتاییە فیزیکییە نزمە و بۆ ناو کاریگەرترین شوێنی نیشتەجێبوونی خالقی بەتوانا، کەلێنی بێ پایان گەورەی نێوان زانینی مرۆییمان و قەڵەمڕەوی بێ وێنە ئیلهامبەخشی خودای دەرخست.

هەریەك لە ئێمە لەگەڵ ئاگاییدا زیاتر لە هەرشتێکی تر ئاشناترە و لەگەڵ ئەوەشدا یەکجار زۆرتر لە شتەکانی تری گەردوون تێدەگەین نەك لە میکانیزمی ئاگایی. ئاگایی ئەوەندە نزیکە لە خۆمانەوە کە تەقریبەن بۆ تاهەتایە دوورە لەوەی پێیبگەین. هیچ شتێك نییە لەبارەی فیزیای جیهانی ماددی (کوارك، ئەلکترۆنەکان، فۆتۆنەکان، گەردیلەکان و هیتر) و بەشێوەی دیاریکراو بونیادی ئاڵۆسکاوی مێشك کە کەمترین سەرەداو لەبارەی میکانیزمی ئاگایی دەدات بەدەستەوە.

لە راستیدا، گەورەترین سەرەداوی واقیعی رووبەری رۆحیمان ئەم (ڕازە قووڵە)ی بوونی ئاگایانەمانە. ئەمەیان نیشانەیەکی رازئامێزترە لەوەی کە زاناکان و دەمارناسەکان خۆیان پیشانیانداوە کە دەتووانن مامەڵەی لەگەڵدا بکەن و نەتووانینیان بۆ ئەم کارە پەیوەندیی گەرم و گوڕی نێوان ئاگایی و میکانیکی کوانتەم– و لێرەوە واقیعی فیزیکی– بە لێڵی هێشتووەتەوە.

بۆئەوەی بە راستی لە ئاستێکی قووڵدا تاووتوێی گەردوون بکەین، پێویستە بە رۆڵی بنچینەیی ئاگایی لە وێنەکردنی واقیعدا بزانین. تاقیکردنەوە زانستییەکان لە میکانیکی کوانتەمدا باوکە بلیمەتەکانی بوارەکەی تووشی شۆك کرد، کە زۆرێکیان (لەوانەش وێرنەر هایزنبێرگ، وۆلفگانگ پۆلی، نیلز بۆهر، ئێروین شرۆدینگەر، سێر جەیمز جینز) رووبانکردە جیهانبینی نادیار بۆ دەستکەوتنی وەڵام. ئەوان درکیان بەوە کرد کە ئەستەمە تاقیکەرەوەی زانست لە تاقیکردنەوەی زانستی جیا بکەیتەوە، و واقیع بەبێ ئاگایی روون بکەیتەوە. ئەوەی کە من لە دەرەوە دۆزیمەوە ئاڵۆسکاوی و مەزنایەتی وەسفنەکراوی گەردوون و ئەوە بوو کە ئاگایی بنەمای هەموو ئەو شتانەیە کە هەن. من ئەوەندە بەشێوەی سەراپاگیر پێیەوە گرێدرام کە زۆرجار جوداییەکی واقیعی نەبوو لەنێوان "من" و ئەو جیهانەی کە بەناویدا دەجوڵام. ئەگەر پێویست بووایە هەموو ئەو کورت بکەمەوە، ئەوا یەکەم جار دەموت، گەردوون زۆر گەورەترە لەوەی کە دەردەکەوێت ئەگەر تەنیا بڕوانینە ئەو بەشانەی کە لەبەرچاوانن. (ئەمە لە راستیدا بەشی هەرە زۆری تێگەیشتنی شۆڕشگێڕانە نییە، چونکە زانستی باو دان بەوەدا دەنێت کە ٩٦٪ی گەردوون "ماددەی تاریك و وزە"یە. ئەم کیانە تاریکانە چین؟ هێشتا کەس نازانێت. بەڵام ئەوەی کە ئەزموونەکەی نائاسایی کردم ئەو کتوپڕە بزوێنەرە بوو کە بەهۆیەوە

ڕۆڵی بنچینەیی ئاگایی، یان ڕۆحم ئەزموون کرد. ئەمە تیۆرە نەبوو کاتێك من لەوێ فێری بووم، بەڵکو ڕاستییەکی هەژێنەر و دەستبەجێ بوو وەکو تەوژمێکی هەوای بەستەڵکی باکوور لە ڕوخسار). دووەم: ئێمە- هەریەك لە ئێمە- بەشێوەیەکی ئاڵۆسکاو و دانەبڕاو ڕایەڵین بە گەردوونەوەی گەورەوە، ماڵی ڕاستەقینەمانە و گەر پێمان وابێ ئەم جیهانە فیزیکییە هەموو ئەو شتەیە کە گرنگە وەکو ئەوە وایە دەرگای ژوورێکی بچوك لەسەر خۆت دابخەیت و وێنای ئەوە بکەیت کە لەدەرەوەڕا هیچ شتێکی تر بوونی نییە. سێیەم: هێزی بەرجەستەی (باوەڕ) لە سازگارکردنی "ئەقڵ بەسەر ماددە"دا. من زۆرجار ئەو کاتەی کە خوێندکاری پزیشکی بووم گێژ دەبووم لەبەرانبەر هێزی سەرسوڕهێنی دیاردەی (دەرمانە درۆزنە)- ئەمەی کە دەبووایە توێژینەوە پزیشکییەکان ٣٠٪ی سوودی ئەو سوودە کۆنترۆڵ بکەن کە پەیوەست بوو بە بڕوای نەخۆش لەمەڕ ئەوەی کە دەرمانێك وەردەگرێت یارمەتی دەدات ئەگەرچی تەنیا ماددەیەکی ناکیمیایی بوو. لەبری بینینی هێزی کاریگەری باوەڕ و ئەمەی کە چۆن کار دەکاتە سەر تەندروستیمان، پیشەی پزیشکی پەرداخەکەی بە "نیوە بەتاڵ" دەبینی- ئەمەی کە دیاردەی دەرمانە درۆزنە بەربەستە لەبەردەم پیشاندانی چارەسەر.

لە چەقی مەتەڵی میکانیکی کوانتەمدا درۆی تێگەیشتنمان هەیە لەمەڕ شوێن لە بۆشایی و کاتدا. تەواوی بەشەکەی تری گەردوون- واتە زۆرینەی هەرە گەورەی- بە ڕاستی دوور نییە لێمانەوە لە بۆشاییدا. بەڵێ، بۆشایی فیزیکی، واقیعی دیارە بەڵام سنوورداریشە. تەواوی درێژی و بەرزیی گەردوونی فیزیکی وەکو هیچ وایە لە بەرانبەر ڕووبەری ڕۆحیدا کە ئەمی لێوە سەرچاوەگرتووە- ڕووبەری ئاگایی (کە لەوانەیە هەندێ کەس وەکو "هێزی ژیان" ئاماژەی پێبکەن).

ئەم گەردوونە یەکجار مەزنە بەهیچ شێوەیەک "دوورەدەست" نییە. لە راستیدا، رێك لێرەیە- رێك لەو شوێنەی منی لێم، خەریکی تایپ کردنم و رێك لەو شوێنەی تۆی لێیت، کە دەیخوێنیتەوە. لە رووی فیزیکییەوە دوور نییە، بەڵام تەنیا لەسەر لەرینەوە(تەرەدود)ێکی جیاواز هەیە. رێك لێرە، هەر ئێستا، بەڵام ئێمە لێی بەئاگا نین چونکە ئێمە بە رادەیەکی زۆر داخراوین لەبەرانبەر ئەو لەرینەوانەی خۆی لەسەر دەردەخات. ئێمە لە رەهەندەکانی کات و بۆشایی ئاشنا دا دەژین، کە بە سنووربەندییە تایبەتەکانی هەستەکانمان و ئاستی ئیدراکمان لەناو مەوداکەدا دەورە دراوە هەر لە کوانتەمی نیمچەی گەردیلەییەوە تا سەرتاپای گەردوون. ئەم رەهەندانە، لەکاتێکدا کە زۆر شتیان هەن بۆیان تەبان، بەهەمان شێوەش لەو رەهەندانەی ترمان دادەبڕێنن کە هەن.

یۆنانییە کۆنەکان هەموو ئەمەیان سەردەمێکی زۆر لەمەوپێش دۆزییەوە و من خۆم ئەوەم دۆزییەوە کە تازە چیان پێکاوە: ئەوانەی وەکو یەکن لەیەکتر تێدەگەن. گەردوون بەشێوەیەک بونیاد نراوە کە بۆئەوەی بە راستی لە هەر بەشێکی ئاست و رەهەندە زۆرەکانی تێبگەیت، ئەوا دەبێ ببیتە بەشێك لەو رەهەندە. یان بە دەربڕینێکی وردتر، دەبێ تۆ خۆت بکەیتەوە بۆ هاوهەستییەك لەگەڵ ئەو بەشەی گەردوون کە تۆ هەنوکە هەتە بەڵام لەوانەیە لێی بەئاگا نەبوویت.

گەردوون سەرەتا یان کۆتایی نییە و خودا لە هەر تۆزقاڵێکیدا ئامادەیی هەیە. بەشێکی زۆری- لە راستیدا زۆربەی- ئەو شتەی کە دەبووایە خەڵکی لەبارەی خودا و جیهانە رۆحییەکانەوە بیڵێن بریتی بووە لە هێنانەخوارەوەیان بۆ ئاستی

ئێمە، نەك بەرزكردنەوەی ئیدراكمان بۆ ئاستیان. ئێمە بە وەسفكردنە ناتەواوەكانمان سروشتی بە ڕاستی مەزنیان، دەنەخشێنین.

بەڵام هەرچەندە قەت دەستپێنەكردووە و قەت كۆتایی نایەت، گەردوون هەڵوەستەی تێدایە، كە مەبەست لێی هێنانەناوبوونی بوونەوەران و ڕێگەدانیانە تا بەشداری لە شكۆمەندیی خودا دا بكەن. ئەو (تەقینەوەی گەورە)یەی كە گەردوونی دروستكرد یەكێك بووە لەو "هەڵوەستە"انە. دیمەنی ئۆم لە دەرەوەڕا، سەرتاپای خەلقی ئۆم-ی دەگرتەوە و لەسەروو پانتایی ڕەهەندیی باڵای بینایی منەوە بوو. لێرەدا بینین، زانین بوو. جیاوازی نەبوو لەنێوان ئەزموونكردنی شتێك و تێگەیشتنم بۆی.

ئێستا "من كوێر بووم، بەڵام ئێستا دەبینم" مانایەكی نوێی گرتبووە خۆی، چونكە ڕێك لەوە تێگەیشتم كە ئێمە لەسەر زەوی چەنێك كوێرین بەرانبەر تەواوی سروشتی گەردوونی ڕۆحی- بەتایبەت خەڵكی وەكو من كە بڕوایان وابوو ماددە كرۆكی واقیعە و بیركردنەوەیەكی دیكە، ئاگایی، ئایدیاكان، هەستەكان، ڕۆح تەنیا بەرهەمی ماددەن.

ئەم دەركەوتنە بەشێوەیەكی یەكجار زۆر كاری تێكردم، چونكە ڕێگەی پێدام بەرزاییە سەرسوڕهێنەكانی هاوهەستی بەدی بكەم و لەوە تێبگەم كە چیمان لە پێشەوەیە، كاتێك هەریەك لە ئێمە سنووربەندییەكانی مێشك و جەستەی فیزیكیمان جێدەهێڵێت.

گەپ. گاڵتە. بەزەیی. هەمیشە پێم وابوو ئەو تایبەتمەندییانە ئێمەی مرۆڤ هێناومانە كایەوە بۆئەوەی خۆمان لەگەڵ جیهانی ناعادیلانە و ئازاربەخشدا بسازێنین. هەرواشە. بەڵام سەرباری ئەوەی كە دڵنەواییبەخشن، ئەم

تایبەتمەندییانە دانپیانانی -کورت و خێرا، بەڵام گرنگ-ی ئەو راستییەن کە ململانێ و ئێشەکانمان هەرچییەك بێ لەم جیهانەدا، ئەوا ناتوانن بە راستی کار بکەنە سەر ئەو بوونە تاهەتاییە گەورانەی ئێمە لە راستیدا تیایاندایین. پێکەنین و گەپ لەناوەرۆکدا بیرهێنەرەوەی ئەوەن کە ئێمە زیندانی ئەم جیهانە نین، بەڵکو رێبوارین پیایدا.

لایەنێکی تری هەواڵی خۆش ئەوەیە کە تۆ پێویست ناکات تەقریبەن بمریت بۆئەوەی سەیرێکی پشت پەردەکە بکەیت- بەڵکو پێویستە کارەکە بکەیت. زانین لەبارەی ئەو قەڵەمڕەوە لە کتێبەکان و سێمینارەکانەوە سەرەتایەکە- بەڵام دواجار، هەریەکێك لە ئێمە دەبێ بچێتە قووڵایی ئاگاییەکەیەوە، چ لە رێگەی نزا یان رامان لە ناخ (مێدیتەیشن) بۆ گەیشتن بەو راستییانە.

رامان لە ناخ بە شێوازی جیاجیا دەبێ. ئەوەیان کە لە سەروەختی کۆماکەمەوە بەکەڵکترین بووە بۆم، ئەوەیە کە (رۆبەرت ئەی مۆنرۆ)ی دامەزرێنەری پەیمانگای مۆنرۆ لە (فابەر)ی ڤیرجینیا دایناوە. ئازادییان لە هەر فەلسەفەیەکی دۆگماتیك، سوودێکی بێ وێنە دەبەخشێت. تاکە دۆگمایەك کە پەیوەندی بە سیستەمی پرۆڤەی رامانی مۆنرۆوە هەبێت ئەمەیە: "من لە جەستەی فیزیکیم زیاترم". ئەم گوزارشتە سادەیە دەلالاتی قووڵی هەیە.

رۆبەرت مۆنرۆ بەرهەمهێنەرێکی سەرکەوتووی پرۆگرامی رادیۆ بوو لە ١٩٥٠کاندا لە نیویۆرك. لە پرۆسەی لێکۆڵینەوە لە بەکارهێنانی تۆمارە دەنگییەکاندا وەکو تەکنیکێکی فێربوونی خەوتن، ئەو ئەزموونی دەرەوەی جەستەی دەستپێکرد. توێژنەوە چڕوپڕەکەی بۆ زیاتر لە چوار دەیە سیستەمێکی بەهێزی لێکەوتەوە بۆ

جوڵاندنی گەڕانی ئاگایانەی قووڵ لەسەر بنەمای ئەو تەکنۆلۆژیا دەنگییەی کە بەناوی "هێمی-سینك" بەرهەمی هێنابوو.

"هێمی-سینك" دەتوانێ کردار و هۆشیارییەکی هەڵبژێردراوانە چڕ بکاتەوە لە ڕێگەی دروستکردنی دۆخێکی پشووئامێز و ئارام. "هێمی-سینك" لەوە زیاتر پێشکەش دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا- دۆخە گەشەسەندووەکانی ئاگایی ڕێگە خۆش دەکەن بۆ گەیشتن بە شێوازە ئیدراکییەکانی تر، لەوانەش ڕامانی قووڵ لە ناخ و دۆخە نادیارەکان. هێمی سینك بریتییە لە فیزیای ڕێکخستنی زرنگانەوەی شەپۆلەکانی مێشك، پەیوەندییان بە سایکۆلۆژیای ئیدراکی و ڕەفتاریی ئاگاییەوە و بە فیزیۆلۆژیی بنچینەیی مێشك-ئەقڵ و ئاگاییەوە.

هێمی سینك بنەمای دیاریکراوی شەپۆلە دەنگییەکانی ستێریۆ ( کە لەرەکانیان لە هەر گوێچکەیەکدا جیاوازە) بۆ بزواندنی چالاکیی شەپۆلی مێشك هەماهەنگکراو. ئەم "ڕیتمە جوت گوێچکەیی"یانە بە لەرینەوەیەك بەرهەم دێن کە جیاوازییەکی حسابییە لەنێوان دوو لەرەی گرنگدا. بە بەکارهێنانی سیستەمێکی تەوقیتی کۆن بەڵام تەواو ورد لە بەشی خوارەوەی مێشکدا کە بەشێوەیەکی ئاسایی دەبێتەهۆی سنووردارکردنی سەرچاوەکانی دەنگ بە ئاراستەی ئاسۆیی دەوری سەر، ئەم ڕیتمە جوت گوێچکەییانە دەتوانن (ڕێتیکیولا ئەکتیڤەیتینگ سیستم)ی نزیك دەستکاری بکەن کە ئیعازی تەوقیتی بەردەوام دابین دەکەن بۆ بنکی مێشك و کۆرتێکس و ئاگایی لێدەکەوێتەوە. ئەم ئیعازانە بزوانی هاوکاتی شەپۆلی مێشك بەرهەم دێنن بە دوورایی ١ بۆ ٢٥ هێرتز (هێرتز یان سوڕێك لە هەر چرکەیەکدا) لەوانەش ناوچەی گرنگی ژێر ئاستی ئاسایی بۆ بیستنی مرۆڤ (٢٠ هێرتز). ئەم نزمترین دوورایییە پەیوەندی هەیە بە شەپۆلەکانی مێشك لە دڵتا (کەمتر لە ٤ هێرتز کە بەشێوەیەکی

ئاسایی لە خەوێکی قووڵی بێ خەوندا هەیە)، تێتا (٤ بۆ ٧ هێرتز کە لە پشوودان و ڕامانی قووڵ و لە خەوی بێ جوڵانەوەی چاودا هەیە)و دوورابیەکانی ئەلفا (٧ بۆ ١٣ هێرتز، کە لە خەو بە خەونەوە یان چاوجوڵان، خەواڵوویی لە سەرووبەری نوستندا و پشوودانێکی بێدارانەدا هەیە).

لە گەشتەکەمدا بەرەو تێگەیشتن لەدوای کۆماکەم، هێمی سینك بەشێوەیەکی کاریگەر ئامرازێکی دابین کرد بۆ سستکردنی کرداری فلتەرکردنی مێشکی جەستەیی لەڕێگەی جیهانییانە هەماهەنگکردنی چالاکیی کارەبایی نیۆکۆرتێکسم، هەروەکو چۆن لەوانەبوو مێنێنجایستەکەم ئەمەی بکردایە بۆ سەربەستکردنی ئاگایی دەرەوەی جەستەم. بڕوام وایە کە هێمی سینك توانای پێداوم تا بگەڕێمەوە بۆ قەڵەمڕەوێك کە هاوشێوەیە لەگەڵ ئەوەیان کە لە کۆما قووڵەکەمدا بۆی چووم، بەڵام بەبێ ئەوەی کە بەشێوەیەکی کوشندە نەخۆش بم. بەڵام ڕێك وەکو خەونەکانی فڕینم کاتێك منداڵ بووم، ئەمە زۆر زیاتر پرۆسەیەکی ڕێگەدانە بە گەشتەکە تا دەرکەوێ– ئەگەر هەوڵ بدەم زۆری لێبکەم، کە لە ڕادەبەدەر بیری لێبکەمەوە، یان یەکجار زۆر پرۆسەکە لەئامێز بگرم، ئەوا ئەنجامی نابێ.

بەکارهێنانی وشەی (هەموو شتێ زانین) نەگونجاوە، چونکە ئەو سەرسامکەرییە و هێزە ئەفرێنەرەی من بینیم لەودیو ناونانەوە بوو. درکم بەوە کرد کە لە ڕاستیدا حەرامی هەندێ لە ئایینەکان بۆ ناونانی خودا یان وێنەکردنی پێغەمبەرانی خودا ڕاستییەکی درکپێکراوی تێدایە، چونکە واقعیەتی خودا لە ڕاستیدا زۆر بە تەواوی لە سەروو هەر تەقەلایەکی مرۆڤەوەیە بۆ وێناندنی خودا لە وشەکان یان وێنەکاندا لەکاتێکدا کە لێرەین لەسەر زەوی.

هەروەکو چۆن هۆشیاریم هەم تاکەکەسی و لەگەڵ ئەوەشدا بە تەواوی یەککگرتوو بوو لەگەڵ گەردووندا، سنوورەکانی ئەوەی کە من وەکو "خۆم" لە کاتێك لە کاتەکاندا بەرتەسك دەبووەوە و لە کاتی تردا فراوان دەبوو بۆ گرتنەخۆی هەموو ئەوەی کە لە سەرانسەری تاهەتاییدا هەیە. هەندێ جار ناڕوونی سنووری نێوان هۆشیاریم و ڕووبەری دەورم ئەوەندە زیاد دەبوو کە دەبوومە سەرتاپای گەردوون. بە دەربڕینێکی تر، بەشێوەیەکی کاتی یەکبوونم لەگەڵ گەردووندا بینی، کە تەواوی کاتەکە هەر هەبووە، بەڵام تا ئەو کاتە کوێر بووم بەرانبەری.

هاوشێوەبوونێك کە من زۆرجار بەکاریدەهێنم بۆ پیشاندانی ئاگاییم لەو قووڵترین ئاستەدا هێلکەی مریشکە. لەکاتێکدا کە لە چەقەکە بووم، تەنانەت کاتێك لەگەڵ گۆی ڕووناکییەکە و تەواوی گەردوونی رەهەند باڵا لە سەرتاپای تاهەتاییدا بووم بەیەك، بەشێوەیەکی بەهێز هەستم کرد کە لایەنی بنچینەیی (بزوێنەری سەرەکی)ی ئەفرێنەرانەی خودا قاوغی دەوری ناوەرۆکی هێلکەیە، بەشێوەیەکی تۆکمە پەیوەندیدارە (وەکو چۆن ئاگاییمان درێژبووەوەیەکی راستەوخۆی خوداوەندە) لەگەڵ ئەوەشدا تاهەتایە لەودیو توانای هاوهەستییەکی رەهادایە لەگەڵ ئاگایی خولقێنراودا. تەنانەت ئەو کاتەش کە ئاگاییم یەکبوو لەگەڵ تاهەتاییدا، هەستم کرد کە ناتووانم بە تەواوی ببمە یەك لەگەڵ هۆکاری ئەفرێنەری، سەرچاوەگرتنی هەموو ئەو شتانە. لە کرۆکی بێ سنوورترین یەکبووندا، هێشتا ئەو دووانەییە هەبوو. ئیمکانی هەیە کە دووانەییەکی وەها ئاشکرا هەروا دەرەنجامی هەوڵدان بێت بۆ گەڕاندنەوەی ئەو هۆشیارییە بۆ ئەم پانتاییە.

من قەت دەنگی ئۆم-م راستەوخۆ نەبیست نە روخساریشم بینی. وەکو ئەوە وابوو کە ئۆم لە رێگەی ئەو بیرۆکانەوە قسەم لەگەڵ بکات کە دەگوت شەپۆلی

دیوارن پیامدا تێپەڕ دەبن، هەموو شتێکی دەورم دەهێننە لەرزە و پیشانی دەدەن کە توێژێکی قوولتری بوون هەیە – توێژێك کە هەموومان هەمیشە بەشێکین لێی، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لێی بەئاگا نین.

کەواتە من راستەوخۆ پەیوەندیم لەگەڵ خودا دا دەکرد؟ بێگومان. کە بەم شێوەیە دەیڵێم کارتێکەر دیارە. بەڵام کاتێك روویدەدا، هەستێکی لەوشێوەیەی نەدەبەخشی. لەبری ئەمە، هەستم دەکرد شتێ دەکەم کە هەر رۆحێك دەتوانێ بیکات کاتێك جەستەی بەجێ دێڵێت و شتێکە کە ئێمە هەموومان دەتوانین هەر ئێستا لە رێگەی شێوازی جیاجیای نزا و رامانی قووڵ بیکەین.

پەیوەندیکردن لەگەڵ خوادا سەرووئاساییترین ئەزموونی وێناکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا سروشتیترینیانە، چونکە خوا هەمیشە لە ئێمەدا ئامادەیی هەیە. عالمە، قادرە، کەسییە– و بەبێ مەرج ئێمەی خۆش دەوێ. ئێمە بە ڕایەڵە ئیلاهییەکەمانەوە بە خودا، وەکو (یەك) گرێدراوینەتەوە.

بەشی سی و چوار

# دوایین تەنگژە

پێویستە ئارەزوومەند بم بۆ وازهێنان لەوەی کە هەم

بۆئەوەی ببمە ئەوەی کە دەبم.

ئەلبێرت ئەنیشتاین (١٨٧٩-١٩٥٥)

ئەنیشتاین یەکێك بوو لە زانا دڵخوازەکانی سەرەتام و ئەو وتەیەی سەرەوەی، هەمیشە یەکێك بووە لە وتە دڵخوازەکانم. بەڵام ئێستا لەوە تێگەیشتووم کە ئەو قسانە بە راستی چ مانایەك دەبەخشن. هەرچەندە دەمزانی چەندە شێت دەردەکەوم کاتێك بەسەرهاتەکەم بۆ هاوکارەکانی بواری زانستم دەگێڕمەوە- هەروەکو دەمتووانی لە دەربڕینە ساردوسڕ یان شڵەژێنەرەکانیاندا ببینم- دەمزانی شتێك دەگێڕمەوە کە مۆرکی راستیی زانستی هەیە. و ئەمەی کە دەرگای کردووەتەوە ڕووەو جیهانێکی نوێ- گەردوونێکی تەواو نوێ-ی تێگەیشتنی زانستی. تێبینیکردنێك کە ڕێزی لە خودی ئاگایی نا وەکو مەزنترین کیان لە هەموو بووندا.

بەڵام ڕووداوێکی ئاسایی ئەزموونی نزیکە مەرگ بەسەر مندا نەهاتبوو. یان بە دەربڕینێکی وردتر، گروپێکی بچوکی ئەزموونەکان هەبوو کە من پیایدا تێنەپەڕیبووم و هەمووی پەیوەندی بە ڕاستییەك هەبوو:

لەکاتێکدا کە لە دەرەوە بووم، شوناسی زەمینیم بیر نەمابوو.

هەرچەندە دوو ئەزموونی نزیکە مەرگ کتومت وەکو یەك نین، من هەر زوو بۆم دەرکەوت کە لە خوێندنەوەمدا بۆ ئەمە، لیستێکی پایەداری تایبەتمەندییە نموونەییەکان هەیە کە زۆرێکیان هەیانە. یەکێك لەوانە دیدار لەگەڵ کەسێك یان زیاتری خەڵکی مردوو بوو کە کەسی ئەزموونی نزیکە مەرگ لە ژیاندا ناسیوویەتی. من کەسم لەوانە نەبینی کە لە ژیاندا دەمناسین. بەڵام ئەم لایەنە زۆر قاڵی نەکردم، چونکە ڕاستەوخۆ بۆم دەرکەوت کە بیرچوونەوەم بۆ شوناسی زەمینیم ڕێگەی بۆ خۆش کردبووم قووڵتر بڕۆم "لەوە"ی کە زۆرێك لە کەسانی ئەزموونی نزیکە مەرگ بۆی ڕۆیشتبوون. بێگومان لەوەدا شتێك نەبوو سکاڵای لەبارەوە بکرێ. ئەوەی کە قاڵی کردم ئەوە بوو کە یەك کەس هەبوو زۆر حەزم دەکرد ببینم. باوکم چوار ساڵ پێش کۆماکەم مردبوو. بە لەبەرچاوگرتنی ئەمەی کە چۆن هەستم کردبوو کە نەمتووانیووە بە ستانداردەکانی ئەو بجوڵێمەوە لەو ساڵە بەفیڕۆچووانەمدا، بۆچی ئەو لەوێ نەبوو پێم بڵێت ئاساییە؟ چونکە لە ڕاستیدا ئاسودەیی شتێك بوو کە خزم یان هاوڕێیانی کەسی ئەزموونی نزیکە مەرگ بەزۆری ئاراستەیان دەکرد. من تامەزرۆی ئەو ئاسودەییە بووم. لەگەڵ ئەوەشدا پێم نەگەیشت.

بێگومان ئەمە بەو مانایە نییە کە هیچ وشەیەکی ئاسودەییم پێنەگەیشت. من ئەمەم لە کچی سەر باڵی پەپولەکە پێ گەیشت. بەڵام هەرچەندە ئەو کچە بێ وێنە و فریشتەئاسا بوو، کەسێك نەبوو کە من دەمناسی. لەبەرئەوەی هەر کاتێك کە بە

سەر باڵی پەپولەکە دەچوومە ناو ئەو دۆڵە نموونەییەوە دەمبینی، روخساریم بە تەواوی بیر هاتەوە- بایی ئەوەندەش زۆر کە دەمزانی قەت لە ژیاندا چاوم پێی نەکەوتووە، لانی کە لە ژیانی سەر زەویمدا. لە ئەزموونەکانی نزیکەمەرگیشدا بەزۆری دیدار بوو لەگەڵ هاورێ یان خزمێکی زەمینی کە کەسانی ئەو ئەزموونانە بەدیان دەکرد.

هەرچەندەی لێی وردبوومەوە، ئەم راستییە گومانێکی خستە مێشکمەوە لەمەڕ ئەوەی کە هەموو ئەمە چ مانایەکی بەخشیووە. ئەوە نەبوو کە گومانم هەبێ لەوەی کە بەسەرم هاتووە. ئەمە مەحاڵ بوو و ئەم گومانەم رێك ئەو کاتە دەبوو کە گومانم بکردایە لە هاوسەرێتیم لەگەڵ هۆلی یان خۆشەویستیم بۆ منداڵەکانم. بەڵام راستیی ئەمەی کە سەفەرم بۆ ئەویدیو بەبێ بینینی باوکم ئەنجامدابوو و چاوم کەوتبوو بە هاوەڵە جوانەکەم لەسەر باڵی پەپولە، کە نەمدەناسی، هێشتا گرفتی بۆ دروست دەکردم. بە لەبەرچاوگرتنی سروشتی یەکجار سۆزاویم لەگەڵ خانەوادەکەمدا، هەستکردنم بە شایستەنەبوون چونکە بەلاوەنرابووم، بۆچی ئەو پەیامە تەواو گرنگە- ی ئەمەی کە من خۆشویستراوم، کە قەت بەلاوە نەنراوم- کەسێك نەیگەیاند کە دەیناسم؟ کەسێکی وەکو. . . باوکم؟

لەبەرئەوەی لە راستیدا "بەلاوەنان" لە ئاستێکی قووڵدا، ئەو هەستە بوو کە لە سەرتاپای ژیانمدا هەمبوو- سەرباری ئەو هەموو باشترین هەوڵانەی کە خانەوادەکەم بۆ سارێژکردنەوەی ئەو هەستە لە رێگەی خۆشەویستییانەوە. باوکم زۆرجار پێی دەوتم ئەوەندە خەمی ئەوە نەخۆم کە پێش ئەوەی لە خانەی منداڵان هەڵمگرنەوە چی روویداوە. ئەو دەیوت "هەرچۆنێك بێت تۆ هیچ شتێکت نایەتەوە بیر لەوەی کە ئەو سەرەتایە چی روویداوە". لەوەشدا ئەو هەڵە بوو. ئەزموونی

نزیکەمەرگم قەناعەتی بۆ دروستکردبووم کە دیوێکی نهێنی هەیە لە خۆماندا کە هەموو دوایین لایەنێکی ژیانی زەمینیمان تۆمار دەکات و ئەم پرۆسەی تۆمارکردنە هەر لە سەرەتای سەرەتاوە دەست پێدەکات. بۆیە لە ئاستێکی پێش ئەزموونکردن و پێش هاتنەگۆدا، بە درێژایی ژیانم دەمزانی کە من بەلاوەنراوم و لە ئاستێکی قووڵدا هێشتا لەکۆششدا بووم تا لەو راستییە بگوزەرێم.

تا ئەو شوێنەی کە ئەم پرسیارە بە کراوەیی مایەوە، دەنگێکی رەتکراوەش مایەوە. دەنگێك کە بە مکوڕی و تەنانەت بە فریودانەوە پێی دەگوتم بەو هەموو کامڵی و سەرسوڕهێنییەی ئەزموونی نزیکە مەرگەکەمەوە، شتێك ئامادەیی نەبوو، لێی کەم بوو.

لە جەوهەردا، بەشێك لە من هێشتا گومانی دەکرد لە ڕەسەنێتی ئەزموونی کۆما قووڵە بێ هاوتا واقعییەکەم و لێرەوە بوونی راستەقینەی سەرتاپای ئەو قەڵەمڕەوە. بۆ ئەو بەشە لە من، بە بەردەوامی هەر "پوچ" بوو لە روانگەی زانستییەوە. و ئەو دەنگە بچوك بەڵام مکوڕەی گومان دەستیکرد بە هەڕەشەکردن لە تەواوی ئەو جیهانبینییە نوێیەی کە من بە هێواشی بونیادم دەنا.

## بەشی سی و پێنج

# وێنەکە

سوپاسگوزاری تەنیا گەورەترینی فەزیلەتەکان نییە، بەڵکو باوکی هەموو ئەوانەیترە.

سیسرۆ(٤٣-١٠٦ی پێش زایین)

دوای چەند مانگێك لە جێهێشتنی نەخۆشخانە، خوشکی خانەوادەی راستەقینەم (کاسی) هاتە سەر هێڵ و وێنەیەکی خوشکی راستەقینەم (بێتسی) بۆ ناردم. من لە ژووری خەوتنەکەم بووم کاتێك گەشتەکەم بە تەواوی دەستی پێکرد کاتێك زەرفە گەورەکەم کردەوە و وێنەیەکی رەنگاورەنگی خوشکەکەم دەرهێنا کە قەت نەمناسیبوو. دواتر لێی وردبوومەوە و زانیم کە لە نزیك ماڵەکەی لە ساوس کالیفۆرنیا وەستاوە. ئەو قژێکی درێژی قاوەیی و چاوی شینی تۆخ بوون و خەندەکەی خۆشەویستی و بەزەیی لێدەباری.

سەر لەبەیانی دواتر، من لە ژووری خەوتن بوو و بەشێکی زیاتر کتێبی (لەبارەی ژیان دوای مردن)ی کوبلەر رۆس-م دەخوێندەوە کاتێك گەیشتمە سەر بەسەرهاتێك

لەبارەی کچێکی دوانزە ساڵان کە بە ئەزموونی نزیکە مەرگدا ڕەت ببوو و یەکەم جار بە دایك و باوکی نەوتبوو. لەگەڵ ئەوەشدا دواجار نەیتووانیبوو چیتر لای خۆی بیهێڵێتەوە و بۆ باوکی گێڕایەوە. ئەو پێی وت کە بۆ شوێنێکی بێ هاوتای پڕ لە خۆشەویستی و جوانی سەفەری کردووە و براکەی بینیووە کە دڵی داوەتەوە.

کچەکە بە باوکی وت "تاکە گرفتێك ئەوەیە کە من برام نییە".

فرمێسك بە چاوەکانی باوکیدا هاتبووە خوار. باسی ئەو برایەی بۆ کچەکەی کرد کە لە ڕاستیدا هەیبووە، بەڵام تەنیا سێ مانگ پێش ئەوەی ئەم لەدایك ببێت مردووە.

لە خوێندنەوە وەستام. بۆ ساتێك کەوتمە ناو بۆشاییەکی نامۆی سەرگێژکەر، بە ڕاستی بیرم نەدەکردەوە یان بیرم نەدەکردەوە. . . بەڵکو تەنیا شتێکم وەردەگرت. بیرۆکەیەك کە ڕێك لەسەر لێواری ئاگاییمدا بوو بەڵام بە تەواوی شوێنی خۆی نەگرتبوو.

پاشان چاوەکانم بە دەوری ژوورەکەدا گەشتیان کرد و کەوتنە سەر ئەو وێنەیەی کاسی ناردبووی. وێنەی ئەو کچەی کە قەت نەمناسیبوو. تەنیا لە ڕێگەی ئەو بەسەرهاتانەوە دەمناسی کە خانەوادەی ڕاستەقینەم بۆیان دەگێڕامەوە و دەیانوت چەنە کەسێکی بە بەزەیی و دڵسۆز بووە. کەسێك کە زۆرجار دەیانوت ئەوەندە پڕ بەزەیی بووە کە لە کرداردا فریشتەیەك بووە.

بەبێ درێسە مۆر و شینە ئاوییەکەی، بەبێ ڕووناکی ئیلاهیی دەروازەکە بەدەوریدا لەکاتێکدا کە لەسەر باڵی پەپولە دانیشتبوو، یەکەم جار ناسینەوەی ئاسان نەبوو. بەڵام ئەمە تەنیا سروشتی بوو. من خودی ئاسمانییەکەیم بینیبوو—

ئەوەیان کە لەسەروو ئەم پانتاییە زەمینییە، بە هەموو تراژیدی و خەمەکانیەوە، دەژیا.

بەڵام ئێستا چیتر بەهەڵەگرتنی ئەو، بەهەڵەگرتنی خەندە پڕ خۆشەویستییەکەی، نیگا ئاسودەبەخش و دڵنیاکەی، چاوە شینە درەوشاوەکانی، لەئارادا نەبوو.

بۆ ساتێك جیهانەکان دیداریان ئەنجام دا. جیهانی من لێرە لەسەر زەوی کە تیایدا دکتۆر، باوك و مێرد بووم. و جیهانی ئەویً– جیهانێکی ئەوەندە گەورە کە کاتێك گەشتت پیایدا دەکرد دەتتووانی هەستی خودی زەمینیت لەدەست بدەیت و ببیتە بەشێکی بێگەرد لە گەردوون، تاریکایی پڕ لە خوداوەند و خۆشەویستی.

لەو ساتەدا، لە ژووری خەوتنی ماڵەکەماندا، لە بەرەبەیانێکی سێشەممەی باراناویدا، هەردوو جیهانی باڵا و ژێرەوە بە یەکتر گەیشتن. بینینی ئەو وێنەیە وایلێکردم کە کەمێك لەو کوڕەی ناو حیکایەتەکان بچم کە سەفەر بۆ جیهانەکەی تر دەکات و دەگەڕێتەوە، دواجار بۆی دەردەکەوێت هەمووی خەون بووە– تائەوەی کە سەیری باخەڵی دەکات و چنگێك خاکی جادوویی لە سەرزەمینەکەی ئەودیو بەدی دەکات.

چەندەی هەوڵمدا نکوڵی لێ بکەم، بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك تاوەکو ئێستا ململانێیەك لەناو ناخمدا دەگوزەرا. ململانێیەك لەنێوان ئەو بەشەی مێشکم کە لە دەرەوەی جەستەم بوو و دکتۆرەکە– ئەو شیفابەخشەی کە پەیمانی بە زانست دا بوو. روانیمە روخساری خوشکەکەم، فریشتەکەم، و زانیم– بە تەواوی زانیم– کە ئەو دوو کەسایەتییەم لە ماوەی چەند مانگی رابردوودا، لە سەروەختی گەڕانەوەمەوە، لە راستیدا یەکێك بوون. لە راستیدا دەبووایە بە تەواوی رۆڵی خۆم وەکو دکتۆر، وەکو زانا و شیفابەخش و وەکو بکەری گەشتێکی زۆر نائەگەری، زۆر

واقیعی، زۆر گرنگ بۆ عەرشی خوداوەند، بگرمەخۆ. ئەمە گرنگ بوو نەك لەبەر خۆم، بەڵکو لەبەر ئەو وردەکارییە قەناعەتهێنەرە بێ وێنەیەی هەڵیگرتبوو. ئەزموونی نزیکە مەرگی من رۆحی پارچەپارچەبوومی چاك کردەوە. رێگەی پێدابووم بزانم هەمیشە خۆشویستراوم و هەروەها پیشانی دام کە هەموو کەسێکی تر لە گەردووندا بەشێوەیەکی رەها خۆشویستراوە. ئەمەش لەو پرۆسەیەدا بوو کە جەستەی فیزیکیم کەوتبووە حاڵەتێکەوە کە بە پێوەرە هەنووکەییەکانی زانست دەبووایە مەحاڵ بێ (هیچ شتێك) ئەزموون بکەم.

بەڵام من باشتر دەزانم. و هەم لەپێناو ئەوانەی کە لێرەن لەسەر زەوی و هەم ئەوانەی کە لەسەروو ئەم زەوییەوە بینیمن، بە ئەرکی خۆمی دەزانم– هەم وەکو زانا و هەم وەکو سۆراخکەرێکی راستی و وەکو دکتۆرێکی خۆتەرخانکردوو بۆ یارمەتیدانی خەڵك– کە ئاشکرای بکەم بۆ زۆرترین خەڵك کە ئەوەی پیایدا تێپەڕیم راستە و واقیعییە و گرنگییەکی بێ پایانی هەیە، بەڵام بۆ هەموومان.

گەشتەکەم تەنیا لەبارەی خۆشەویستییەوە نەبوو، بەڵکو بەهەمان شێوە لەبارەی ئەوەوە بوو کە کێین و چۆن هەموومان پەیوەستین بەیەکەوە– مانای کتومتی هەموو بوون. فێربووم کە لەوێ کێم و کاتێك گەڕامەوە بۆم دەرکەوت کە دوایین پارچە شکاوەکانی ئەمەی کە کێم لە خوارەوە، بەیەکەوە لکاونەتەوە.

(تۆ خۆشویستراویت). ئەم وشانە بوون کە پێویستم بوون گوێم لێیان بێت کاتێك هەتیو بووم، وەکو منداڵێك کە بەلاوە نرابوو. بەڵام هەر ئەم وشانەشن کە هەریەك لە ئێمە لە سەردەمە ماددیەدا پێویستی بەوەیە بیانبیستێت، چونکە لە سۆنگەی ئەمەی کە بە راستی کێین، بە راستی لە کوێوە هاتووین و بە راستی بۆ کوێ دەڕۆین، هەموومان (بە هەڵە) هەستی هەتیوێکمان هەیە. بەبێ گەڕاندنەوەی ئەو

یادەوەرییەی رایەڵبوونی مەزنمان و خۆشەویستیی بێ مەرجی خالقمان، هەمیشە لەسەر ئەم زەوییە هەست بە بزربوون دەکەین.

ئەوەش من. هێشتا زانام، هێشتا دکتۆرم و لەم ڕووەوە دوو ئەرکم لە ئەستۆیە: ڕێز لە راستی بگرم و یارمەتیدەربم بۆ چاکبوونەوە. ئەمەش واتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەم. بەسەرهاتێك کە بە تێپەڕبوونی کات دڵنیام لەبەر هۆکارێك ڕوویداوە. نەك لەبەرئەوەی کە من کەسێکی تایبەتم. تەنیا ئەوەیە کە دوو ڕووداو بە هەماهەنگ و لە یەك کاتدا ڕوویاندا و پێکەوە پشتی دوایین هەوڵەکانی زانستی کورتکەرەوەیان شکاند کە بە جیهانیان دەوت قەڵەمڕەوی ماددی هەموو ئەوەیە کە هەیە و ئەمەی کە ئاگایی، یان رۆح– هی تۆ و هی من– ڕازی مەزن و جەوهەریی گەردوون نییە.

من بەڵگەی زیندووم.




پێویستە مرۆڤ بەدوای ئەوەدا بگەڕێت کە هەیە،
نەک ئەوەی کە پێی وایە دەبێ هەبێت

ئەلبێرت ئەینشتاین




لەبڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما 

نرخ ( ٤٠٠٠ )دینار